

د. خالید زیادە

# دەوڵەتی عوسمانی لەنێوان چاکسازیو هەڵوەشانەوەدا

## کاریگەریی ئەوروپا لەسەر عوسمانیەکان لەسەدەی هەژدەهەمدا

وەرگێرانی:

خالید مەحمود کەریم

د. خەلیل عەلی موراد پێشەکی بۆ نوسیوە

د. خالد زیادە

# دەوڵەتی عوسمانی لەنێوان چاکسازی و هەڵوەشانەوەدا

## توێژینەوەیەک سەبارەت بە کاریگەریی ئەوروپا لەسەر عوسمانیەکان لە سەدەی هەژدەهەم

وەرگێڕانی

خالید مەحمود کەریم



ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

سلێمانی ٢٠١٣

## ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

دامەزراوەیەکی کەلتورییە بەپێی بڕیاری کۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ ی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی هۆشیارکردنەوەی سیاسی، فراوان کردنی چوارچێوەکانی رۆشنبیریی گشتی، تۆکمەکردنی بەهاکانی دیموکراسیو مافی مرۆڤ و دادی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵدا، تاوتوێ کردنی مەسەلەکانی بیری هاوچەرخو دابین کردنی کەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی کادیران لە بوارە هەمەجۆرەکاندا.


- دەوڵەتی عوسمانی لەنێوان چاکسازیو هەڵوەشانەوەدا
- وەرگێڕانی: خالید مەحمود کەریم
- بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیرانی (ی.ن.ك)
- دیزاین: کەمال حامد
- تیراژ: ٢٠٠٠
- ژمارەی زنجیرە: (٤٩٩)
- ژمارەی سپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان (١١٠٦) ساڵی ٢٠١٣


**تێبینی: ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا ناوی (دۆزینەوەی پێشکەوتنی ئەوروپا)یە بەڵام بۆ ناوە کوردیەکە بەم ناوە دانراوە.**




**سەرپەرشتیاری زنجیرەی کتێب**
**عوسمان حەمەڕەشید گوورون**

www.pukhoshiari.com
info@pukhoshiari.com

# پێشەکی

عوسمانییەکان لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمی زاینیدا خاوەن میرایەتیـەکی بچـوك بـوون، کـە دەکەوتـە ڕوی بـاکوری ڕۆژئـاوای ئـەنادۆڵ، لەسـەر سـنووری ئیمپراتۆریـای بیزەنتـی. ئـەم میرایەتیـە یـەکێك بـو لـەو چـەندین میرایەتیـە تورکانـەی یـا تورکمانانـەی لـەو قۆناغـەدا لـە ڕۆژئـاواو ناوەڕاستی ئەنادۆڵدا بوونیـان هـەبوو، لەوانـە (ذولقەدەر، قەرەمان، حەمید، ئایدین، تیکە، ساروخان...هتـد)، بـەڵام لە هـەمان کاتدا تاکە میرایـەتیش بـو، توانی وردە وردە و لەسـەرخۆ گەورەو بەرفراوانبێت، بەجۆرێك لە کۆتایی سەدەی چواردەهەمدا بـو بـە دەوڵـەتێکی بـەهێز، پاشـان بـە ئیمپراتۆریایـەك، دوای ئـەوەی توانیـان لەسـەر دەسـتی سـوڵتان موحەمـەد فـاتیح، قسـتەنتینیە داگیربکـەن لـە سـاڵی (١٤٥٣ز.)دا، پاشـتریش لـە سـەردەمی سـوڵتان سولەیمان قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦ز)دا، بوون بە دەوڵەتێکی جیهانی. لـەو کاتـە بـەدواوە ئـیتر دەوڵـەتی عوسمـانی خـاکێکی بـەرینی دادەپۆشـی، کـە نزیکـەی (١٥,٠٠٠,٠٠٠ کـم٢) دەبـو. موڵکـەکانی عوسمانی بەدیوی ئەورووپادا دەگەیشتە ناوچەکانی نزیك تریستاو ڤیـەنناو سـنووری پۆڵۆنیـا. هـەروەها دەریـای (ڕەش) و دەریـای (ئـازوف)یـش بـوون بـەدوو دەریـای عوسمـانی، هـەروەها بەشـی ڕۆژئاوای (قەوقازیا)ش ملکەچی حوکمڕانی عوسمانییەکان بوون، بەهەمان شێوە ڕۆژئاوای ئاسیا، لە نێویاندا کوردستان و ناوەڕاست و باشوری عێراق و وڵاتی شام و دورگەی عەرەب، لەوێشەوە باکوری ئـەفریقا لـە میسـرەوە تـا سـنووری مەراکیشـی دەگرتـەوە.

عوسمانییەکان ئیتر گەیشتنە ئاستێك، توانیان خۆیان بۆ ڕۆڵگێڕان لە سیاسەتی جیهانیدا ئامادەبکەن، بۆ ئەوەی ببنە ڕەگەزی بالانسێکی نوێ، لەم بارەوە شانبەشانی سەرکەوتنەکانیان لە بواری سەربازیدا، جموجوڵێکی کارای دیبلۆماتیشیان دەستپێکرد، ئەم سیاسەتەش بەسبوو تا دەوڵەتی عوسمانی بکات بە یەکێك لە سێ دەوڵەتە جیهانیەکەی ئەوروپا، هەڵبەتە شانبەشانی هەر یەك لە ئیمپراتۆریای بنەماڵەی هاپسبێرگ و مۆسکۆی قەیسەری.

هاوکات لەگەڵ بەرینبوونی دەوڵەت و بالادەستبوونی لە ڕوی سەربازییەوە، عوسمانییەکان بوون بەخاوەن ئابوریەکی بەهێزیش، لە ڕاستیدا داهاتە داراییەکانی دەوڵەت بەشی پتەوکردنی هێزو تواناکانی دەکردن. ئەو ئابوریە بەهێزە لە پاراستنی ئامێرە جەنگیە ترسناکەکەیاندا یارمەتیدان، بەگوێرەی ئاماژەپێکردنی خودی مێژوونوسە ئەوروپیەکان، عوسمانییەکان خاوەن تاکە سوپای جێگیرو ڕێکخراوبوون، کە لە ئەوروپادا حسێبی بۆ کرابێت، بەهۆی چاکەی ئەم سوپاوە توانیان لە دیدی ڕەعییەت و دراوسێکانیاندا وەك هێزێکی ترسناك دەرکەون، داودەزگا سوپاییەکانی عوسمانی لەڕوی تۆپخانەو کاروباری ئەندازیاری و پشتیوانی و کۆمەك و تەموینیشەوە لە سەروی ئاستی سەردەمەکەی خۆیدابو، بەجۆرێك هیچ دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا لە توانایدا نەبو بەرهەڵستی هێزەکانی ئینکیشاری و سوارەی دەرەبەگەکان (سوپاهی)ی عوسمانی بکات.

هەڵەیە هێزو توانای دەوڵەتی عوسمانی بە تەنها لە هێزو توانای دام ودەزگا سەربازییەکانیدا ڕاڤەبکرێت، لەم مەسەلەدا سیستمی کارگێڕی و سیاسی دەوڵەت ڕۆڵی خۆیان هەبووە، بەتایبەت کە عوسمانییەکان لەو قۆناغەی مێژووی دەوڵەتەکەیاندا بەوە

ناسـرابوون دەتـوانن لێهـاتوترین پیاوەکانیـان بـۆ پۆسـت و پلـەو پایـەکانی دەوڵـەت هەڵبـژێرن، بـێ لەبەرچاوگرتنی بنچینەو ڕەگـەزی تـاك و ڕەوشـە کۆمەڵایەتیەکـەی، بـەم کـارە وەك "دۆناڵـد کـواترت"ی مێژوونوس دەڵێت، بێ جیاوازیکردن هەل و فرسەتی ئیشکردنیان بە هەموان بەخشی، بۆ ئەوەی لـە بـوارە سـەربازی و مەدەنیەکانـدا ڕاژەو خزمەتی خۆیان پێشکەش بە دەوڵـەت بکـەن. تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی شانزەهەمیش سوڵتانە عوسمانییەکان بۆخۆیان کاروباری دەوڵەتیان بـەڕێوەدەبردو بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ بەدواداچـونیان بـۆ گرفـت و کێشـەکانی ڕەعییـەت و سـکاڵاکانیان دەکـرد، کارەکـان بەخێراییـەکی گونجـاوەوە ئـەنجام ئـەدران، سـوڵتانەکانیش کەسـانێکی پراکتیکـی بـوون و دەوڵەتەکـەیان پەرەپێـدا بـۆ ئـەوەی بتوانێـت ڕووبـەڕوی پێداویستیە ناچارییەکانی ئەو ڕۆژگارە ببێتەوە. هەروەها حوکمڕانی عوسمـانی بەشـێوەیەکی گشـتی، لـەڕوی ئابوریـەوە بـۆ دانیشـتوانی ناوچە داگیرکراوەکان کەم ئەرکتربوون، چونکە ئەو باج و خەراجانەی ئەمان (واتا عوسمانییەکان) لێیان وەردەگرتن، کەمتربو لەوەی کـە بـە ئاغاکانی پێشوتریان دەدا.

دەتـوانین بڵـێین سـەردەمی سـوڵتان سـولەیمان قـانونی خـاڵی "ترۆپکـە" لـە مێـژووی دەوڵـەتی عوسمانیـدا، کـە زیـاتر لـە حـەوت سـەدەی (١٢٩٩-١٩٢٢ز) خایانـدووە، چـونکە ئـەو سـەردەمە بـۆ عوسمانییـەکان ئـیتر خـاڵی کۆتـایی گەیشـتنە بـە شـکۆمەندی و ئەوپـەڕی قۆناغـەکانی بـەرینبوونی دەوڵـەتیش پێکـدێنێت. دوای سەردەمی قانونیش پرۆسەیەکی پاشەکشێی لەسـەرخۆو درێژخایـەن لـە دەوڵـەتی عوسمـانی و دام و دەزگـا جیاجیاکانیـدا دەسـتیپێکرد. پیاوانی دەوڵەت و سیاسەت و خـاوەن فیکـر لـە دەوڵـەتی عوسمانیـدا لـە کـاتێکی زۆر زوودا هەسـتیان بـەم پرۆسـەی پاشەکشـێکردنە

کردبووو، بەتایبەت هەر لە سەدەی حەڤدەهەمی زایینیەوە. لەم ڕووەوە نووسین و نامەگەلێکی زۆریان بۆ بەجێهێشتوین، تیایدا هۆکارەکانی لاوازی و پاشەکشێیان لە دەوڵەتی عوسمانیدا باسکردووە، بۆ چارەسەرکردنیشیان ڕاسپاردەو ڕێگەچارەیان پێشنیارکردووە. و تێکڕای ئەو نووسین و نامانەش، بەئومێدی سوودلێوەرگرتنیان پێشکەش بە سوڵتانەکانی بنەماڵەی عوسمانی، یان بە سەدرولئەعزەمەکان (سەرۆك وەزیرانەکان) کراون.

لە نێو ئەوانەی کە نووسین و نامەیان بۆ بەجێهێشتوین و دەستیان خستۆتە سەر ناتەواویەکان لە دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا، مێژوونووسی عوسمانی موستەفای کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدولمەولا (١٥٤١-١٦٠٠ز)یە، کە بەناوی "عالی" ناسراوە و کتێبی "ئامۆژگاریکردنی سوڵتانەکان"و "گەنجینەی هەواڵەکان و هەوێنی بیرو ئاوەزەکان" و نامەیەکیشی بەناوی " حەقیقەتی هەرێمەکان" نووسیوە، هەروەها چەندین کتێبی تر، هەروەها زانای بۆسنی "حەسەن کافی"یە (ساڵی ١٦١٦مردووە) کە بەناونیشانی "بنەماکانی حوکمڕانی لە سیستمی جیهاندا " کتێبێکی نووسیوە، هەروەها عەینی عەلی ئەفەندی، کە نامەیەکی نووسیوە بە ناونیشانی "قوانين ال عثمان در خلاصة مضامين دفترى ديوان"، و کتێبێکیش بە ناونیشانی "وظيفة خوران مراتب بندكان ال عثمان"، هەروەها "قوچی بەگ"، کە لە ساڵی (١٦٣٠ز) دا نامەیەکی گرنگی نووسیوەو پێشکەشی سوڵتان مورادی چوارەمی (١٦٢٣-١٦٤٠ز) کردووە، کاتب چەلەبی یان حاجی خەلیفە (لە ساڵی ١٦٥٧ز مردووە)، کتێبێکی بە ناونیشانی "تەرازوی حەق لە هەڵبژاردنی حەقترینیدا" و نامەیەکیش بەناونیشانی "دەستوری کار بۆ چارەسەرکردنی دۆخی نالەبار" نووسیوە، هەوروەها حسێن هەزار فەن (١٦٠١-

١٦٧٩ن) کە کتێبێکی بە ناونیشانی "کورتکردنەوەی بەیان لە یاساکانی بنەماڵەی عوسمان"دا نووسیوە، چەندین نووسەری تر.

بانگهێشتکارانی ڕیفۆرم لە کتێب و نامەکانیاندا هۆکارە سەرەکییەکانی لاوازی و کەنەفتی دەوڵەتیان لەم خاڵانەدا کورتکردۆتەوە: گەندەڵی کارگێڕی و دارایی لە دەوڵەتدا، ئافاتی بەرتیلخواردن و خزمخزمێنە، کە ئاکام کەسانێکی بێتواناو نەشیاوی هێنایە پێش و گەیاندنیە پۆستە سەربازی و کارگێڕی و داوەرییە باڵاکانی دەوڵەت، داتەپینی دام و دەزگاکانی دەوڵەت، بەتایبەت دام و دەزگای سەربازی و ئاکامە قورس و پڕوکێنەرەکانی بۆ سەر بودجەی دەوڵەت. خراپبوونی دۆخی جوتیاران کە بەشێوەی باج و خەراج و بەروبووم و داهاتیان لە لایەن سەربازانەوە بەتاڵان دەبران و دادەقەپێندران، ئەمەش بووە هۆی پشتگوێخستنی کشتوکاڵ و بەجێهێشتنی گوندەکان لەلایەن جوتیارەکانەوە، ئاکامیش گەنجینەی دەوڵەت لە داهاتی دارایی بێبەش بو. هەروەها ئاماژەیان بۆ نەمانی دادو دورکەوتنەوە لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام کردووە و پێیان وابووە ڕێگەچارەی ئەم خراپەکارییانە بەگەڕانەوە دەبێت بۆ سەر دۆخی داو دوزگاکانی دەوڵەت لە سەردەمەکانی پێشوترداو هێنانەپێشەوەی کەسی شیاوو لێهاتو لە بەڕێوەبردندا، شایەنی وتنە نوێبوونەوە یا وەرگرتن لە ڕۆژئاوا لە زەین و خەیاڵی ئەو ڕیفۆرمخوازانەدا مەسەلەیەك بو بوونی نەبو، بەتایبەت کە دەوڵەتی عوسمانی هێشتا هێزو توانا سەربازییەکانی خۆی پاراستبوو، لای ئەورووپییەکانیش وەك دەوڵەتێکی ترسناك دەبینرا.

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمەوە، بە دیاریکراویش لە نێوان سالآنی (١٦٨٤-١٦٩٩ز)دا، بالآنسی هێز لە نێوان ئەوروپیەکان و دەوڵەتی عوسمانیدا گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەرداهات، بەتایبەت پاش شکستی عوسمانییەکان لە جەنگی دژ بە "یەکێتی پیرۆز"دا، کە هەر یەك لە نەمساو پورتوگال و پۆڵۆنیاو بووندوقیەو دانیمارك و ئینگلتەراو فەرەنساو روسیای قەیسەری لە خۆگرتبوو، ئەوەبو لە کۆتاییدا دەوڵەتی عوسمانی ناچاربوو لە ساڵی (١٦٩٩ز)دا بە پەیماننامەی کارلۆڤتز قایلبێت. دەوڵەتی عوسمانی لەم پەیماننامەدا لە بەرژەوەندی نەمساو بووندوقیەو پۆڵۆنیا هەرێمگەلێکی بەرچاوی دۆڕاند، لە ڕاستیشدا ڕێکەوتنی کارلۆڤتز بەوە وەسفکراوە، کە دەستپێکی هەلوەشاندنەوەی قەوارەی دەوڵەتی عوسمانی و یەکەم هەنگاوی ئەو پرۆسە مێژووییەیە کە لەو ڕۆژگارەوە بەشێوەیەکی لەسەرخۆ و وردە وردە بەردەوام بووە.

لەگەڵ دوبارەبوونەوەی شکستەکانی عوسمانیدا بەرامبەر ئەوروپاو پاش ئەوەو لە بۆنەی تردا هەر لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمەوە، ئیتر لاوازی و کەنەفتی عوسمانی بەرامبەر بە ئەوروپا ئاشکرابوو، بانگهێشتکارانی ڕیفۆرم لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەستیانکرد کە چارەسەرکردنی لاوازی و داتەپین بە تەنها بەگەڕانەوە بۆ دۆخی جارانی دام و دەزگاکانی دەوڵەت لە سەردەمی بەهێزیی دەوڵەتی عوسمانیدا نایەتەدی، بەڵکو مەسەلەکە پێویستی بە ناسینی زیاتری ئەوروپاو دۆزینەوەی هۆکارو ئامرازەکانی پێشکەوتن و هێزو تواناکانی هەیە، هەروەها هەوڵ و کۆشش بۆ سوود لێ وەرگرتنیان، بۆ "نوێکردنەوەی" داو دەزگاکانی عوسمانی، بەتایبەتی داو دەزگا سەربازییەکان. ئەمەش دەروازەی قۆناغێکی نوێ بوو لە هەوڵ و کۆششەکاندا بۆ ڕیفۆرمکردن لە دەوڵەتی

عوسمانی لەسەر بناغەی وەرگرتن لە ڕۆژئاوا. بەڵام ئەمە ئەرکێکی ئاسان نەبوو، چونکە لە لایەن گروپگەلێکەوە کە هەستیاندەکرد ڕەنگە نوێکردنەوە هەڕەشە بکات لە پێگەو دەسەڵاتیان لە دەوڵەتی عوسمانیدا، ڕووبەڕووی بەرهەڵستیەکی توند بوونەوە. لە پێش ئەوانەش سەرانی سوپای ئینکیشاری‌و زۆرێك لە زانایانی ئایینی، کە پێیان وابوو وەرگرتن لە ڕۆژئاوا "بیدعە"یەو لەگەڵ پەیڕەوی ئیسلامدا ناکۆك و نەگونجاوە. ئەم ناکۆکییە لە نێوان بانگهێشتکارانی "نوێکردنەوە" لە دەوڵەتی عوسمانی و لە نێوان نەیارانیدا ئاقاری بزاڤی ڕیفۆرمسازی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەدرێژایی هەردو سەدەی هەژدەو نۆزدە دەستنیشانکرد. لەگەڵ ئەوەی نەیارانی ڕیفۆرم ئەوەندەی پێیان کرا دژ بەوەرگرتن لەڕۆژئاوا وەستانەوەو چەندین بزاڤی هەڵگەڕانەوەشیان ئەنجامدا، کە تیایدا چەندین کەس بوونە قوربانی، لەوانە سەدروئەعزەم ئەلداماد ئیبراهیم پاشا لە ساڵی (١٧٣٠ز)، سوڵتانی ڕیفۆرمخواز سەلیمی سێیەم لە ساڵی (١٨٠٧ز)دا، بەڵام پێویستیی بۆ ناسینی ئەورووپاو وەرگرتن لێی لەوە گەورەتربوو کە گروپە نەیارەکانی نوێکردنەوە بتوانن تا دوایی لە بەردەمیدا بوەستن. دەوڵەتی عوسمانی چاری نەبوو لە کاریگەربوون زیاتر بە پێشکەوتنی ئەورووپا، نەك تەنها لەسەر ئاستی نوێکردنەوەی هێزی سەربازی، بەڵکو لەسەر ئاستی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیش. لە بەدواداچوونی کاروانی دۆزینەوەی عوسمانییەکاندا بۆ پێشکەوتنی ئەورووپا ئەمە بەڕوونی دەبینرێت، لە میانەی ناردنی باڵوێزەکانەوە بۆ ئەورووپا، هێنانی ڕاهێنەری سەربازی، وەرگێڕانی نووسینە ئەورووپیەکان، بەتایبەتیش فەرەنسی، بۆ سەر زمانی تورکی، هەروەها لە بەدواداچوونی بزاڤی ڕیفۆرم و نوێکردنەوە لە دەوڵەتی عوسمانیدا، هەر لە سەرەتای

سـەدەی هەژدەهەمـەوە تـا دەگاتـە بزاڤـی ڕیفـۆرم و نوێکردنـەوەی بەرفراوان، لە نێوان سالآنی (١٨٣٩-١٨٧٦ز)دا، کە بە "تـەنزیمات" ناسراوە.

لەواقیعدا بزاڤی ڕیفۆرم و نوێکردنەوە ڕویەکی گرنگی مێژووی عوسمـانی پێکـدەهێنن، زۆرێکـیش لـە مێژوونوسـە تـورك و ڕۆژئاواییەکان کە بواری ڕاژەکردنیان مێژووی عوسمانییە، لە میانی تۆژینـەوەو شـیکردنەوەکانیانەوە لـەم مەسـەلەیان کۆڵیوەتـەوە، هـەروەها چـەند دەیەیەکـە سـەرنجی تـوژەرو مێژوونوسـە عەرەبەکانیشی ڕاکێشاوە. لەم ڕووەوە مێژوونوسی لوبنانی "خالد زیادە" یەکەمین ئەو کەسانەیە کە لەم بابەتەی کۆڵیوەتەوە کاتێك کتێبێکـی بەناونیشـانی "دۆزینـەوەی پێشـکەوتنی ئـەوروپا: تۆژینەوەیەك لە کاریگەرییەکانی ئەوروپا لەسەر عوسمانییەکان لە سـەدەی هەژدەهەمـدا"، لـە سـالّی ١٩٨١ز، لـە "دار الطلیعـة"، لـە بەیروتـدا، بلآوکـردەوە. شـایەنی هێمـا بۆکردنـە خالـد زیـادە کەسایەتیەکی ڕۆشنبیرییەو لەسـەر ئاستێکی بـەرین ناسـراوە، لـە لوبنـان لـە شـاری تـەرابولس لـەدایکبووە، لـە فەڕەنسـا دوکتـۆرای هێنـاوە، لـە بـواری مێـژوو ئەدەبـدا چـەندین کتێبـی نووسـیوە، یەکێکیان ئەو کتێبەیە کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆکرد، کە زیاد لە جارێك چاپکراوەتەوە، دوایین جاریان، "دار الشروق" لە قاهیرە لە سالّی (٢٠١٠ز)دا، بەناونیشـانی "المسـلمون و الحداثـة الاوربیـة" بلآویکردۆتـەوە، هـەروەها کتێبـی "الخسـیس والنفـیس: الرقابـة و الفساد فی المدینـة الاسلامیة"، کتێبـی "کاتـب السلطان"، کتێبـی "العلمـاء و الفرنسـیین فـی تـاریخ الجبرتـی" و کتێبـی "مدنیـة علـی المتوسط" کە لە سێ بەرگ پێکهاتووەو بریتیە لە ژیاننامەی خـودی نووسـەر. شـایەنی وتنـە هەنـدێ لـە کـارە ئەدەبیـەکانی نووسـەر بـۆ

زمانەكانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتالی وئیسپانی وەرگێڕدراون، هەروەها نووسەر بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ بەڕێوبەری كۆلیژی ئەدەبیات و زانستە مرۆڤایەتیەكان بووە لە تەرابولس، لە ئێستاشدا باڵویزی لوبنانە لە میسرو لە كۆمكاری عەرەبیدا نوێنەری هەمیشەیی وڵاتەكەیەتی.

بێگومان ئەم كتێبە لەو كتێبە بایەخدارو گرنگانەیە كە باس لە سەرەتای پەیوەندیەكانی كۆمەڵگە ئیسلامیەكان دەكات لەگەڵ ژیاری نوێی ئەوروپادا، گرنگی و بایەخی كتێبەكەش لەوەدایە ئەو ڕاوبۆچوونە هەڵە ڕاستدەكاتەوە كە بۆ ماوەیەكی زۆر باوبوو، گوایە سەرەتای پەیوەندی موسڵمانەكان لەگەڵ ژیاری ڕۆژئاوادا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری داگیركردنی فەرەنسیەكان بۆ میسر لە ساڵی (١٧٩٨ز) و ئەو ڕێنیسانسەی كە بەدوای خۆیدا هێنای. دوكتۆر خالد زیادە ئەوەمان بۆ ڕوندەكاتەوە كە لەم ڕووەوە ئەزمونێكی تر هەیە، نزیكەی سەدەیەك دەكەوێتە پێش ئەزمونەكەی میسرەوە، ئەویش دۆزینەوەی دەوڵەتی عوسمانییە بۆ پێشكەوتنی ئەوروپا لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەهەم و هەوڵدانە بۆ وەرگرتن لە ڕۆژئاوا هەر لەو كاتەوە.

ئەم كتێبە" هەر لە یەكەم چاپیەوە لە ساڵی (١٩٨١ز)دا، شوێنێكی شیاوی لە كتێبخانەی مێژوویی عەرەبیدا پڕكردۆتەوە، مێژوونوس و تۆژەرە عەرەبەكانیش بەگەرمی پێشوازییان لێكرد. سروشتیە كە بڵێین وەرگێڕانی ئەم كتێبە بۆ زمانی كوردی لە بواری تۆژینەوەی مێژووی عوسمانی و پەیوەندی نێوان موسڵمانەكان و ئەوروپا لە سەرەتای سەردەمە نوێیەكاندا، كارێكی گرنگ و بەنرخە بۆ كتێبخانەی كوردی، دەستنیشانكردنی ئەم كتێبە لەلایەن برای بەڕێز مامۆستا خالد مەحمود كەریم، بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی

کـوردی کارێکـە دروسـت، بـە ئومێدیشـم سـەرەتایەکی دروسـت و سەرکەوتوبێت و لە بواری وەرگێڕانی نووسینە مێژووییەکانیدا کاری تر بەدوای خۆیدا بێنێت، کە بێگومان دەبنە هۆی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی.

## دەسپێك

دۆزینـەوەی پێشـکەوتنی ئـەورووپا لـە لایـەن موسـڵمانەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ چی ڕۆژگارێك و کاریگەریی ئەورووپا لە چی کاتێکدا لە جیهانی ئیسلامیدا دەرکەوت؟

بـەدیوێکی تـردا، ئایـا دەکـرێ بـۆ سـەرەتای ئـەم کاریگەرییانـە بـەدوای مێژوویـەکی دیـاریکراودا بگـەڕێین، لـە کاتێکـدا کـە زانـراوە موسڵمانەکان بە هەرێمێکی فراوان و پان و بەریندا، دور یان نزیك لە ئـەورووپا بڵاوبوونەتـەوە، هـەر لـە تەنجـەوە نزیـك تەنگەبـەری جەبـەل تاریق تا ئەستەمبوڵ بە هـەردوو بەشە ئەورووپی و ئاسیاکەیەوە تا وڵاتی ئێران و هیندستان و تا دەگاتە ئەوپەڕی وڵاتی چین.

ئـەم جیهانـە فراوانـە بـەگوێرەی سـەردەمەکانی ئـەورووپا، لەگـەڵ سەرەتای سەردەمە نوێیەکاندا، خاوەن هیچ جۆرە یەکێتییەك نەبو، کە هەرێمە دور لـە یەکەکانی پێکەوە کۆبکاتـەوە، پەیوەنـدیش لە نێوان ئەم هەرێمانـەدا نـەمابوو، بێهودەیی و بێبـاکی شـوێنی پەیوەسـتەگی ئیمان و ژیاری گرتبووەوە، هەندێ لە گەلان لـە چارەنوسـی ئیسـلامی سیاسی دابڕابوون و ئیسلامی تایبـەت بە خۆیـان پێکهێنـابو، کەچی گەلانی تر لە بەشـدارییکردن لـە کـاروانی ئیسـلام دوورکەوتبوونـەوە، کە هێشتا لە سەرەتای هەڵکشانی ژیارو ڕۆشنبیری خۆیدابو. هـەموو ئـەم دۆخـە پاساوو بیانوی خۆیـان هـەبو، دەمـێ ڕۆژگـاربوو ئیسـلام یـەکێتی سیاسـی خـۆی، کـە نزیـك بـو لـەوەی لـە قۆنـاغێکی کـورتی هەڵکشـانی مێژوویـدا پێـی ئاشـنابێت لەدەسـتدابوو، لـە کـاتێکی تریشدا زمانی هاوبەشی لەدەستدا، کە بەهـەرحاڵ یەك زمـان نـەبوو، ئیـدی لـەنێو ئیسـلامدا کلتـوری بنچـینە ئاسـیایی و ئـەفریقایی جۆراوجۆر بڵاوبووەوە کە هەمیشە زیندوبوون تیایدا.

جیهانی ئیسلام ئەو کاتەی ئەوروپییەکان ڕووبەڕویان بوونەوە، بێجگە لە ئیمان خاوەن هیچ ڕەگەزێکی تری یەکخستنەوە نەبوون، کە لە هەمان کاتدا خاڵێك بو بۆ دورخستنەوەو یەکخستن، دەوڵەتی عوسمانی لەو کاتەدا نوێنەرایەتی بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامیی دەکرد، بەڵام نوێنەرایەتی تێکڕای موسڵمانەکانی نەدەکرد، هێشتا گروپگەلێکی بەرفراوان لە موسڵمانەکانی ئاسیا، لە دەرەوەی هەژمونی سیاسی ئەودا دەژیان، دەسەڵات و هەژمونیشی لەنێو ویلایەتەکانیدا وانەبو بەجۆرێك کە بتوانێ بەر بە دەرکەوتنی هەندێ حاڵەتی ئۆتۆنۆمی و گەشەکردنی یەکەگەلێکی سیاسی دەرکەوتو لە ڕوی سروشتی و دیمۆگرافییەوە بگرێت.

لەم دۆخە پەرت و بلاوەی دونیای ئیسلامیدا لە سەرەتای چاخە نوێیەکاندا، کاریگەرییەکانی ئەوروپا دەستیپێکرد، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتاکانی ئەم کاریگەرییە لە هەرێمە ئیسلامییە نزیك یا دراوسێیەکانی کیشوەری ئەوروپادا دەرنەکەوتن، بە پێچەوانەوە لە هەرێمە دورەکانیدا دەرکەوتن، ئەوانەی نەکەوتبوونە ژێر هەژمونی دەریاوانی عوسمانی یا هەر هێزێکی تر. شارە کەنارییەکانی هیندستان کە ئاوێتەیەکبوون لە خەڵکی موسڵمان و هیندۆسی، لە سەدەی پانزەهەمەوە بەیەکەمین دونیادۆزو سەرکێش و بازرگان و سەربازە ئەوروپییەکان ئاشنابوون. لە سەدەی دواتردا چەندین کۆڵۆن (مستعمرە)ی ئەوروپی لە چەندین شاری هیندستاندا دامەزران. بەڵام لە سەدەی حەڤدەهەمدا پورتوگالیەکان یەکەمین کاریگەری خۆیان جێهێشت، وشەگەلێکی زۆری پورتوگالی تێکەڵ بە زمانە لۆکاڵیەکان بوون. لە هەمان کاتدا ئینگلیزەکان پێش ئەوروپیەکانی تر کەوتن، کاتێك ڕەوەندەکانیان جێپێی خۆیان لەو ناوچانەدا پتەوکرد، ساڵی (١٦٤٠ن) لە شاری "مەدراس"دا، نزیکەی چوارسەد خێزانی

ئینگلیزی هەبوون، ئیدی لەوکاتە بەرەو سەرەوە پانتای ئەورووپی بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەیکرد، بە جۆرێك لە ناو شارەکەدا شارێکی تری ڕۆژئاوایی هاتەبوون[1].

بێجگە لە مەدراس، چەند شارێکی تر هەبوون، لەوانە "گوا"و "سورات"و "بۆمبای"، کە هاوشێوەی مەدراس ئامادەبوونێکی ئەورووپی چڕو پڕیان بەخۆوەدیت، ئینگلیزەکان بە تەنیا نەبوون، بەڵکو ڕەوەندی تریان لەگەڵدابوو، لەوانە فەرەنسییەکان و هۆڵەندییەکان، هەروەها سەرکێشی چەندین وڵاتی تر.

هەندێ لەو ئەورووپیانە ڕاژەی سەربازییان پێشکەش بە هەندێ لە میرە لۆکاڵیەکان دەکرد، عەساف ئەلدەولە نەباب فەرمانڕەوای هەرێمی ئەوود-Aoudh یەکێك لە ئەفسەرە فەرەنسیەکان بەناوی "کلود مارتن" کردۆتە کاپتنی گەنجینەی تفاق و کەرەستەی دەریاوانی خۆی، ئەم فەرەنسیە لە کالکۆتاو لیکناو.....هتد چەند خوێندنگەیەکی دامەزراندوە، لەڕاستیدا شاری لیکناو کاریگەرییەکی ئەورووپی قووڵی بەخۆوەبینی، بەجۆرێك لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا لە بوارەکانی ژیانی مادی و ڕۆشنبیری و لە ئاستی فیکریشدا گەشەکردنی ئەم کاریگەریانەی دەرکەوتن[2].

موسڵمانەکانی هیندستان لە یەکەمین ئەو موسڵمانانەبوون کە ئاشنایەتییان لەگەڵ کاریگەرییەکانی ئەورووپا پەیداکردووە، هەڵبەتە بەهۆی پێگەی هیندستانەوە، کە هەر لە سەدەی شانزدەهەمەوە کەوتبوە ژێر کاریگەری دەریاوان و بازرگانە ئەورووپییەکان، لەوێشەوە

---

[1] sastari: sur les rapports entre l,lnde morderne et L,occident.dans l,lnde millenaire et actuell.paris Gallimard 1969 pp. 126 -146

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣٢.

لەژێر کارتێکردنی کۆمپانیا بازرگانییەکان لە سەرجەم وڵاتەکانی ئەوروپا.

لە ڕاستیدا فۆرم و شێوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەوروپییەکاندا وەك یەك نەبوون، لە دیوەکەی تری جیهانی ئیسلامیدا، پاش ئەوەی عوسمانییەکان چاوتێبڕین و تەماحکاریی ئەوروپیەکانیان لە ڕۆژئاوای عەرەبیدا وەستاند، لە نێوان میرە لۆکاڵییەکان و پاشاکانی ئەوروپادا لە میانی نێردراوەکانەوە کە پاش گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکانی خۆیان سەرنج و بینینەکانی خۆیان سەبارەت بە ئەوروپا دەگواستەوە، پەیوەندییەکان سەریانهەڵدا. لە سەردەمی مەولای ئیسماعیلی سوڵتانی فاس و مەراکش (١٦٧٢-١٧٢٧ن)دا نێردراوە موسڵمانەکان ئەوانەی هەڵوێستەیان لەسەر پێشکەوتنەکانی ئەوروپا دەکرد، ژمارەیان زیادی کرد، ئەوانە پاش گەڕانەوەیان ڕاپۆرتەکانی خۆیان پێشکەشکرد و دیتن و گۆشەنیگاکانی خۆیان سەبارەت بە ئەوروپا نوێدەکردەوە. لە نێوان نێردراوەکانی مەولای ئیسماعیل دا بۆ ئیسپانیا لە ساڵی (١٦٩٠ن)دا وەزیر غەسانی هەبوو[1]، کە ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی سەبارەت بە گەشتەکەی و بینینەکانی نووسیوە، دەتوانرێ بە یەکەم هەوڵ دابنرێت بۆ نوێکردنەوەی تێڕوانین بۆ وڵاتێك لە وڵاتە ئەوروپییەکان. ڕاپۆرتەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عائیشە کە لە ساڵی (١٦٩٩ن)دا ڕەوانەی فەرەنسا کراوە، تەواکەری ڕاپۆرتی پێشووترەو تیایدا تیشکی خستۆتە سەر ڕەوشی باو لە فەرەنسای سەردەمی لویسی چواردەهەمدا[2].

لە ناوەندی ئیسلامی-عوسمانیدا، لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم و دوای مانەوەی میر فەخرەددین مەعنی دووەم لە ئیتالیا

---

[1] Chantal de la veronne: Vie moulay Ismail, paris, Geuthner 1974 p. 21

[2] هەمان سەرچاوە ل٥٢.

(١٥٧٢-١٦٣١ن) لەگەڵ وڵاتێکی ئەورووپیدا ئەزموونێکی پەیوەندی دروستبوو، ناوبراو لەو ماوەدا توانی ڕێکخستنی سەربازیی پەیڕەوکراو لە ئیتالیا، هەروەها پێشکەوتنی پیشەسازی چەك و تفاقی جەنگی و شێوازە پەیڕەکراوەکان لە کشتوکاڵ و تەلارسازیدا تێبینی بکات. میر دوای گەڕانەوەی بۆ لوبنان، هەوڵیدا سوود لە بینینەکانی وەرگرێت، ئەوەبوو بە پاڵپشتیی شارەزا ئەورووپیەکان دەستیدایە بوونیادنانی کۆشك و ڕێکخستنی کشتوکاڵ و بەرزکردنەوەی ئاستی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان[1].

لە دەوڵەتی عوسمانیشدا لە سەدەی پانزەهەمەوە سوود لە چەك و تفاقی جەنگی پێشکەوتوی ئەورووپا وەرگیراوە، هەروەها پەیوەندییەکان لەنێوان عوسمانییەکان و وڵاتانی ئەورووپیدا نەپچڕان، بەڵام عوسمانییەکان لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم بەدواوە ئاوڕی جدییان لە ئەورووپا و ڕوداوەکانی دایەوە. لەو کاتە بەدواوە پەیوەندییەکانی عوسمانی لەگەڵ ئەورووپای هەڵکشاوو بەرزەفڕدا ئاڕاستەیەکی هەڵکشاوو سەقامگیری وەرگرت[2].

لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا، لە یەککاتدا سەرەتاکانی پاشەکشێی هێزی عوسمانی و دەرکەوتنی هێزی ئەورووپیی وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر موسڵمانەکان، لە بارێکدا گەر پشتگوێ بخرێت، تێبینیکراوە. لەڕاستیشدا شکستی عوسمانی لە ساڵی (١٦٩٩ن)دا حەزو ئارەزووی چینی حوکمڕانی عوسمانی بۆ سوودوەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی ئەورووپا بزواند.

---

[1] سەبارەت بە گەشتەکەی فەخرەدین بۆ ئیتالیا بڕوانە، الخالدی الصفدی :لبنان فی عهد الامیر فخرالدین المعنی الثانی، بیروت١٩٦٩، ل ل٢٠٨-٢٤٠.

[2] Hammer, purgstall : histoire de L'empier ottoman.paris 1835-1843.vol: 17. pp.134-167

لـه مـاوەی سـەدەی هەژدەهەمـدا لای سـوڵتانه یـەك لـه دوای یەكـەكانی عوسمـانی، ئـەو بڕوایـە جێگیربـوو، كـە ڕیفـۆرم و شوێنكەوتنی ئەزمونی ئەوروپی لە بواری ڕێكخستنی سەربازی و زانسـتەكاندا كـارێكی پێویسـتە، ئەمـەش چـەندین كاریگـەری لـە ئەستەمبوڵدا بەجێهێشت. كاریگەری ئەوروپا بۆ سەر عوسمانییەكان لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی سێهەم (١٧٨٩-١٨٠٧ان)، كە یەكەم سوڵتانی عوسمانی بوو ڕیفۆرمێكی گشتگیرو سیستمێكی نویٚ، كە لەسـەر شـێوازی ئـەوروپی بوونیادنرابێـت، ئەنجامبـدات، ئاڕاسـتەو فـۆرمێكی نوێیـان وەرگـرت. ئـەم هـەوڵ و كۆششـانە كـە ئـەزمونی عوسمـانی بـۆ پەیوەنـدیگرتن لەگـەڵ پێشـكەوتنی ئـەوروپا دەوڵەمەنـدكرد، لـە تێكـڕای جیهـانی ئیسلامیدا بایـەخی تایبـەتی خۆیان هەبوو.

لـە سـەردەمی سـەلیمی سـێهەم دا عوسمانییـەكان لـە میـانی نێردراوەكانیـان یـا لـە میانی شـارەزا ئەوروپیەكانـەوە بەتایبـەتیش فەڕەنسیەكان، ئـەوروپای نـویٚ و بیروبـاوەڕە نوێیـەكانی ئـەوروپایان دۆزییـــەوە، كـــە وانـــەكانی "ئەنـــدازەو ماتماتیـــك"یـــان بـــە خوێنـدكارەكانیان دەوتـەوەو بـە ئامانجـەكانی شـۆڕشـی فەڕەنسـی لـە دروستكردنی كۆماری فەڕەنسی و سیستمی نویٚ ئاشنایان دەكردن. هەر لەو كاتەدا میسر لەگەڵ ڕاگەیاندنەكانی پۆناپەرتدا پێشوازی لە چەمكەكانی ئازادی و یەكسانی دەكرد.

لـە هیندستانیشـدا، كـە زۆر زوو بـە كاریگەرییـەكانی ئـەوروپا ئاشـنابوون، لای موسـڵمانەكانی بیرۆكەیـەكی سـەراپاگیر لەسـەر پێشكەوتنی ئەوروپاو ئەو بیروباوەڕانەی كە بەڕێوەیدەبرد پێكهات. یـەكێك لەوانـەی ڕۆڵیـان هـەبوو لـە ناسـاندنی ئـەوروپاو شۆڕشـی فەڕەنسـی بـە موسڵمانەكانی هیندسـتان، ئـەبو تالـب خـان (١٧٥٢-

١٨٠٦ان) بوو، کە کاری ڕاژەی لای عەساف ئەلدەولە دەکرد و لە ساڵی (١٧٩٩ان)دا سەردانی ئەورووپای کردبووو، ماوەیەك لە لەندەن و پاریس دا مابووەوە، ئەبوو تالب خان لە ڕاپۆرتەکەیدا کە سەبارەت بە سەردانەکەیەتی، باس لە پێشکەوتنی ئینگلتەرە دەکات و وەسفی پشەسازیی و سیستەمە سیاسی و داوەری و داراییەکەی دەکات. هەروەها لە بارەی فەڕەنساوە باس لە پەرەسەندنەکانی شۆڕشی فەڕەنسی و بیرەباوەڕی پیاوەکانی دەکات. هۆکارەکانی نووسینی ڕاپۆرتەکەی یا کتێبەکەی "گەشتەکەی تالب بۆ وڵاتی فرەنج"* بەم جۆرە دەخاتەڕوو:

ڕوداوەکانی گەشتێك بۆ ئەورووپا ڕەنگە بۆ هاوڵاتیانم سوودبەخش بێت، بە تایبەت کە داب و نەریتی ئەو گەلە جیاوازانەی سەردانم کردون هێشتا لای ئاسیاییەکان نەناسراوە موسڵمانەکان بەزانینی ئەو ژمارە هەرە گەورە لە دۆزینەوە کە ئەو وڵاتانە پێیگەیشتون، سوودو پەند وەردەگرن[1].

سەبارەت بەوڵاتی فارس کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەورووپادا دواکەوتبوو، ئەوا لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا چەندین نێردراوی فەڕەنسی بەخۆوەبینی، لەگەڵ دەستپێکی سەدەی نۆزدەهەمدا پۆناپەرت دوای جێهێشتنی میسر، وەك ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە هیندستان بایەخی بە فارس دا، لە ڕاستیشدا داگیرکردنی زەوی و

* ئەم کتێبە لە لایەن (مصطفی جواد)ەوە لە زمانی فەڕەنسییەوە کراوەتە عەرەبی و بەناوی "رحلة ابی طالب خان الی العراق و اوروبا"، دەزگای (الوراق) ساڵی ٢٠٠٧ لە بەغداد لە چاپێکی نوێدا بڵاویکردۆتەوە، شایەنی ئاماژەبۆکردنە ئەبوتالب خان لە گەڕانەوەدا بە وڵاتی کورداندا تێپەڕیوە، ناوچەکانی دیاربەکر، ماردین، نەسیبین، عەنکاوە، ئاڵتون کۆپری، کەرکوك، قەرەتەپپەی دیوەو هەندێ لە سەرنج و تێبینییەکانی خۆیشی لەبارەیانەوە تۆمارکردووە (وەرگێڕ).

[1] Aboul taleb khan: Voyages.paris 1819 p.2

زارو موڵكەكانى فارس لەلايەن ڕووسەكانەوە فەتح عەلى شاى هاندا داواى كۆمەك لە پۆناپەرت بكات، هەروەها هانيدا بير لە پرۆژەى ڕيفۆرمى سەربازى بكاتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش هەندێ لە ياريدەرەكانى ڕەوانەى پايتەختەكانى ئەوروپا كرد، بۆ بەدواداچون و بەسەركردنەوەى شێوەى كاركردنى دامو دەزگا سەربازييەكان، لە نێو ئەوانەدا كە بۆ ئەو مەبەستە ناردبوى "ميرزا ساڵح" بوو، كە لە ساڵى (١٨١٥ز)دا سەردانى ئينگلتەرەى كرد، ئەوەبوو پاش گەڕانەوەى ڕاپۆرتێكى نوسى و تيايدا فۆرمى كاركردنى دام ودەزگاكانى پەرلەمانى ئينگليزى خستۆتەڕوو، هەروەها باسى لە شۆڕشى فەرەنسى و بيروباوەڕەكانى كردووە، ئەم هەڵەى قۆستۆتەوەو لە ڕاپۆرتەكەيدا ڕەخنەى خۆى ئاڕاستەى پياوە ئايينيەكانى وڵاتەكەى كردووە[1].

لەگەڵ كۆتايى سەدەى هەژدەهەم و سەرەتاكانى سەدەى نۆزدەهەمدا، ئيتر پێشكەوتنى ئەوروپا بۆ تێكڕاى جيهانى ئيسلامى شتێكى نامۆ نەبوو، ئەوەبوو لە هەندێك ناوچەدا بيركردنەوە لە پێويستى وەرگرتنى تەكنيكى نوێ و ئاگابوون لەو سيستمەى وڵاتە ئەوروپيەكانى باڵادەست كردبووو بەسەر وڵاتانى ترى جيهاندا هاتەگۆڕێ.

لەم چوارچێوەشدا ئەزمونى عوسمانى بايەخى تايبەتى خۆى هەيە، چونكە عوسمانييەكان لە يەكەمين لايەنانەكان بوون، كە دواى بەئاگاهاتنەوە لە پێشكەوتنەكانى ئەوروپا هەوڵيانداا لێى سوودمەندبن، لەم ڕووەوە ئەوان يەكەم ئەزمونى ڕيفۆرم و چارەسەرسازيان لە جيهانى ئيسلاميدا جێبەجێكرد، تا ئەو ڕۆژگارە هەر ئەوانيش يەكەم وڵاتى بەهێزى ئيسلامى بوون.

---

[1] art.dustur.Vol 2 p. 666:Ei2

کاتێـك دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـاڵی (١٢٩٩ز) دا دروسـتبوو، ئیسـلام کـە حـەوت سـەدە بـو لـە ناوەڕاسـتی دورگـەی عەرەبیـدا سەریهەڵدابوو، توانیبوی بە ناوچەیەکی فراواندا، کە چەندین بەش لـە ئاسیاو ئـەفریقاو بەشێك لـە ئـەوروپای دەگرتـەخۆ، بڵاوبێتـەوە. گەلانی جیاواز لە هەر سێ کیشوەرەکە هاتنە ڕیزی ئایینی نوێ، کە ئیسلام لەژێر دەسەڵاتی ئایینی خۆیدا کۆیکردبوونەوە جیهانێکی نوێ لە تەنیشت جیهانە کۆنەکاندا، هەروەها لەسەر حیسابی ئەوان هاتـەبوون، ئـەویش جیهـانی ئیسـلام بـوو، یـان بەلایـەنی کەمـەوە جیهانێك بوو هەژمونی ئیسلام دەیگرتەوە[1].

دەوڵـەتی ئیسـلامی، کـە ئایینەکـەی خـۆی بڵاوکـردەوە، بـەزۆری زۆرداری نەیسەپاند، چەندین گروپی جیاوازی مەسیحیی یا جوو و گروپە ئایینیەکانی تر ئایینی خۆیان پاراست، ئیدی لە چوارچێوەی ئەو سیستمەی کە ئیسلام دەستنیشانیکردبووو، تێکڕای ئایینـەکان پێکـەوە ژیـان، هـەروەها کـەلتورە جیاوازەکـانیش لـە چوارچـێوەی بالأدەستی ئایینی ئیسلام و کەلتووری عەرەبیدا درێژەیان بەژیان دا. بەلأم ئەم بالأدەستبوونە کە هەڵگری هەردوو ڕەهەندی ئایـدیۆلۆژی و کـەلتوری بـوو، بەتـەواوی سـەقامگیر نـەبو، بەتایبـەت پـاش ئـەوەی ڕەگـەزی عـەرەب لـەنێو گـەلانی ژمـارە زۆرتـردا بـوون بـە کەمینـە, لـە

---

[1] Lombard m.L'islam dans sa premiere grandeur. Paris , flammaion , 1971, p 100-
وەرگێڕانی عەرەبی ئەم کتێبە(الاسلام فی عظمته الاولی) دار الطلیعة،بیروت ١٩٧٧ دەرچووە.

ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی زایینەوە فارسەکان وەك هێزێکی کاریگەر لە سەر ئاستی دەسەڵات دەرکەوتن، لە پاش سەدەیەکی تر ڕەگەزی تورکان دەرکەوتن، کە دواتر دەبنە خاوەن هێزو یەکەمجار لە میانی سەلجوقیەکان و دوای ئەوانیش لە میانی عوسمانییەکانەوە ناوەندەکانی دەسەڵات کۆنترۆڵ دەکەن.

**ئیسلام و مەسیحیەت**

هۆکاری خێرا بڵاوبوونەوەی ئیسلام دەگەڕایەوە بۆ لاوازی و کەنەفتی ئیمپراتۆرە کۆنەکان، هەروەها بۆ ڕێسای جیهاد یان جەنگی پیرۆز، کە ئیسلام لە قۆناغە بەراییەکاندا بە شارەزایی و لێزانییەوە جێبەجێیدەکرد. ئیسلام لە دوای دەرکەوتنیەوە ڕوبەڕوی دو نەیاری گەورە بوویەوە ئەوانیش: فارس و بیزەنتە بوون، موسڵمانەکان پاش ساڵانێکی کەم لە دەرکەوتنیان لە دورگەی عەرەبیدا توانییان دەوڵەتی فارس لەنێوبدەن، سەبارەت بە دەوڵەتی بیزەنتەش، ئەگەرچی توانرا لە سوریاو بەیت ئەلمەقدس دوربخرێنەوە، بەڵام ئیسلامی تازە پەلوپۆ هاوێژ نەیتوانی لەنێویان بدات، ئەوەبو لە نێوان هەردوو لای ناکۆکدا ساڵانێکی درێژ، بەدرێژایی چەندین نەوە جەنگ بەردەوامبو.

بەردەوامبوونی شەڕو ململانێ لە نێوان موسڵمانەکان و مەسیحییەکاندا چەندین هۆکاری جۆراوجۆری هەبوو، هەر یەك لە هەردوو دەوڵەت نوێنەری هێزێکی مەزنیان دەکرد، کە خەونی خۆی لە بڵاوبوونەوە و بەرپەرچدانەوەی مەترسییەکانی ئەویتردا دەبینیەوە، بە دیوێکی تردا، هەر لایەکیان دەوڵەتەکەی خۆی وەك ناوەندی ژیارو مرۆڤایەتی دەبینی، ئەویدیش وەك نمایندەی کوفرو بەربەرییەت.

سەبارەت بە موسڵمانەکان ڕێسای جیهاد ڕۆڵی خۆی هەبو لە مانەوەی ناکۆکییەکاندا بە زیندویی. هەرچی موسڵمان بوو دونیای دابەشدەکرد بۆ سەر دوو هەرێم: هەرێمی ئیسلام و هەرێمی جەنگ یان ئەو هەرێمەی کە جارێ ملکەچ نەکراوە لەبەر ئەوە لە ڕوی تیۆرییەوە ئاشتەوایی مەسەلەیەکی سەقامگیر نەبوو، ئیدی بەهۆی ئەم ناکۆکییەوە لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا گومان و بەدحاڵیبوون هەمیشە زاڵبوو بەسەر هەر یەك لە موسڵمان و مەسیحیدا. لە کاتێکدا موسڵمان بڕوای وابوو کە مەسیحییەکان لە ڕێنماییە بنچینەییەکانی مەسیح لایانداوە مەسیحییەکانیش دانیان بە ئایینی نوێی ئیسلامدا نەدەنا. بەڕاستی دەتوانین بڵێین: "مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ تێگەیشتن لەویدی، بەو پێیەی ئەویدی بێبڕوا (کافر)ە، ئیتر شایستە نیە ببێتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی هێمنانەی هاوسەنگ"[1]

جەنگە دوبارەبووەکان و ترس لەویدی سەرچاوەی بەدحاڵیبوون و دورکەوتنەوەی زیاتر بوون لە یەکدی، بەتایبەتی کە هێزی موسڵمانەکان لای بیزەنتەکان ئەو هەستەی هێنایەئارا کە مەترسییەکی ڕاستەقینە هەڕەشە لە ناوەندی دەوڵەتەکەیان دەکات. لە نێوان چارەکی کۆتایی سەدەی حەوتەمی زایینی و سەرەتای سەدەی هەشتەمدا، قستەنتینیە بە بەردەوامی هەڕەشەی کەوتن و داڕوخانی لەسەربو. بە پێچەوانەی ئەوەشەوە لە هەمان قۆناغدا، هیچ ناوەندێك لە ناوەندە ئایینی و سیاسییەکانی ئیسلام هیچ جۆرە هەڕەشەیەکیان لەسەر نەبو. ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی موسڵمانەکانی گۆشەگیرکرد و لە بیرکردنەوە لە دونیای دەرەکی

[1] Grunebaum ,G. E. V.:medieval Islam. Chicago 1945, p. 30

دوریخستنەوە، بەجۆرێك کە تێڕوانینەکانی بۆ نزمی و کەمی ئەویدی تەنها لە سنووری ئیمان و کەلتوردا نەوەستا، بەڵکو لایەنەکانی تریشی گرتەوە. لای جوگرافیناسە موسڵمانەکان هەرێمەکانی ئیسلام دەکەوتە ناوچەی چوارەمی ناوەندەوە لە جیهان، کە لای ئەوان دابەشکرابوو بۆ سەر حەوت ناوچەی جۆراوجۆر و جیاواز لە ڕوی ساردی و گەرمییەوە. بەم پێیە هەرێمەکانی ئیسلام شوێنە فێنکەکانی دەگرتەوە، بەڵام تێکڕای ئەوروپا دەکەوتە ئەو هەرێمانەی کە فێنك نەبوون تا دەگەیشتە هەرێمی حەوتەم کە ژیان مەحاڵ بوو تیایدا [١].

لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکان بە تەواوی نەبچڕابوون، دەتوانین تۆمارێکی درێژی ئاڵوگۆڕکردنی نێردراو لە نێوان دەوڵەتی خەلافەت و بیزەنتەدا بژمێرین. زیاتر لەوەش کەرتبوونی دونیای مەسیحی بۆ دوو کەرت، کە دوو دەسەڵاتی ناکۆك فەرمانڕەواییان دەکرد، لە بەرامبەریشدا بوونی دوو خەلافەتی عەباسی لە ڕۆژهەڵات و ئەمەوی لە ئەندەلوس لە دونیای ئیسلامیدا، دەرفەتی بۆ پەرەسەندنی پەیوەندیی دۆستایەتی لە نێوان عەباسیەکان و ئیمپراتۆریای ڕۆژئاوایدا ڕەخساندبوو[٢]. بەگشتی، بایەخی جیهانی مەسیحی بە ئیسلام، ئەگەرچی کەمیش بێت، لە بایەخی موسڵمانەکان بە جیهانی مەسیحی زیاتربو، پێدەچێ هەندێ هۆکاری جۆراجۆر ڕۆڵیان لەم مەسەلەدا هەبوبێت، بەڵام بایەخی ڕێژەیی هیچی لە هەڵوێستی دوژمنکارانە نەگۆڕی. سەردانەکان و نێردراوەکانی بیزەنتە بۆ نێو وڵاتی ئیسلام تێڕوانینەکانی نەگۆڕین، بەپێچەوانەوە وێنەی

---

[1] Lewis, B:the muslim discovery of Europe, B.S.O.A.S. XX 1957 pp.409-416

[٢] بڕوانە مجید خدوری: الصلات الدبلوماطیقیة بین هارون الرشید و شارلمان. بغداد ١٩٣٩

موحەمــەدی پێغەمبــەر (د.خ) لەگــەڵ ڕۆژگــاردا زیــاتر تێکــدەدرا. وەرگێڕانی قورئان بۆ سەر زمانێکی ئەورووپی پاش تێپەڕبوونی زیاتر لــە پێــنج ســەدە لــە دەرکــەوتنی ئیســلام، بەڵگــەی درێژەکێشــان و بەردەوامبوونی ڕەتکردنەوەی ئەویدیە، پییر دو کلینی" Pierre de cluny" (لــە ساڵی ١١٥٦ز.دا مـردووە) قورئـانی وەرگێـڕا، لـەو کاتـە بەدواوە بایەخدانی ئەورووپا بە ئیسلام.بە بەردەوامی زیادی کردووە، لەو قۆناغەدا ئیدی ئەورپییەکان لە شێوەی جەنگەکانی خاچپەرستیدا دەردەکەون.

بەڵام جەنگەکانی خاچپەرستی کە بێگومان ئەورووپای بە دونیـای ئیسـلام ئاشـناکرد، لـە ڕوویـەکی درێـوی ئـەورووپا زیـاتر هیچـی بـۆ موســڵمانەکان ئاشــکرانەکرد، لــە ڕویــەکی تــرەوە ئــەم جەنگانــە ئــەورووپای ڕۆژئــاوای وەك هێزێکــی نــوێ و کــارا لــە گۆڕەپــانی ڕووداوەکاندا لە دەریای ناوەڕاست دەرخست.

## دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆژئاوا

عەشیرەتەکانی تـورك کـە بـە "غـوز" ناسـرابوون، تـەنها لەسـەر حیسابی موڵك و زەوی و زاری بیزەنتیەکان توانیـان پـەلوپۆ بهاوێـژن و لــە ئاســتی میرایەتیــەوە بگوێزنــەوە بــۆ ئاســتی دەوڵــەت[1]. عوسمانییەکان نیشتنە سەر میراتی دەوڵەتە ئیسلامیەکانی پێشوتر، هــەروەها پرانسیپی بەناوبانگی جیهادیشیان بە میـرات بۆ بـەجێما، ئەوەبوو پرۆسەی فتوحاتیان نوێکردەوە، کـە لـە سـەرەتادا ئیسـلامی بڵاوکــردەوە، هــەروەها عوسمانییــەکان لــە پێشــینانەوە خــەونی دەستبەســەراگرتنی قستەنتینیە و لـەنێوبردنی دەوڵـەتی بیزەنتـەیان

---

[1] Koprulu. M.F: Les origins de L'empire ottoman. Paris 1935

بەمیرات بۆ بەجێما. دوای چەندین بەرەنگاربوونەوەو جەنگ و شەڕو شۆڕ پڕۆژەی عوسمانی جێبەجێکرا، لە ساڵی (١٤٥٣ز)دا حەوتەم سوڵتانی عوسمانی بە ناوی موحەمەد فاتح توانی قستەنتینیە داگیربکات، بەو کارەیش ئیمپراتۆریایەکی دێرینی لەگەڵ مێژووە درێژەکەیدا هەڵوەشاندەوە. هەڵکشانی عوسمانی بە داگیرکردنی ڕۆژهەلاّتی عەرەبی و چەند بەشێك لە ئەفریقا لە لایەن سوڵتان سەلیم-وە لە ساڵی (١٥١٦ز)دا هاتەدی، لە کاتێکدا سوڵتان سولەیمان قانونی، دەیەمین سوڵتانەکانی عوسمانی، توانی لە ساڵی (١٥٢٩ز)دا هێزەکانی ببات بۆ ناوەوەی ئەوروپا، تا نزیك ڤیەننا، ئەم ڕوداوەش سەرلەنوێ یادەوەرییەکانی هەژمون و بالاّدەستی ئیسلامی هێنایەوە یادی ئەوروپییەکان[1].

تورکە عوسمانییەکان سەرچاوەی هەڕەشەیەکی گەورەبوون، لە کاتێکدا دەریای ناوەڕاست لەژێر کۆنترۆڵ و دەسەلاّتی دەریاوانی ئەواندابوو، ئەوروپای ڕۆژئاوا پاش لاوازبوونی هەڕەشە ئایینی و بڕواداریییەکان، وەك مەترسییەکی سیاسی یان کەلتوری تەماشای دەکردن، لە نیگای واقعبینەکانیشدا عوسمانییەکان هێزێك بوون وەك ئەوانیتر، ئیدی لە نێوان ولاّتانی ئەوروپا و دەوڵەتی عوسمانیدا لە کاتەکانی جەنگ و ئاشتەواییدا لەسەر بنەما سیاسییەکان، کە دوربوون لە بڕوای ئایینییەوە، هاوپەیمانێتی گرێدەدران "وێڕای ئەوەی ئەم بڕوایە وەك ئایینێکی پیرۆز کە توند بە دڵەکانەوە گرێدرابوو، مابووەوە"[2].

---

[1] بڕوانە دراسة مكسيم رودنسون: الصورة الغربية و الدراسات العربية الاسلامية. ضمن تراث الاسلام.٨ -سلسلة عالم المعرفة. الكويت ١٩٧٨.ص٥٥.

[2] هەمان سەرچاوە ل٥٥.

لای خۆیانیشـــەوە عوسمانییـــەکان لەگـــەڵ دەوڵـــەت و میرایەتییـەکانی ئـەوروپادا پەیوەنـدیی بەرژەوەنـدییان گرێـدابوو، لەوانە پاپا کە بەخششێکی ساڵانەی لە سوڵتان بایەزیدی دووەمەوە (١٤٨١-١٥١٢ز) وەردەگـرت، لـە پێنـاو هێشـتنەوەی براکەیـدا لـە بەندیخانـە کـە لەسـەر چـونە سـەر تـەخت، ڕکابـەری بـوو (مەبەسـت تـەختی عوسمانییـە.و.)، سـەفیری عوسمـانی لـە ئەنجومـەنێکی کڵێسایی نهێنیدا لە لایەن پاپا ئەلکسەندەری شەشەمەوە (١٤٣١-١٥٠٣ز) لـە ئاهـەنگێکی شـکۆداردا پێشـوازی کـرا، چـەندین پیـاوی ئـاینی و نوێنـەرانی ئـەوروپی لـە ئەنجومەنەکـەدا ئامـادەبوون، وەك زانراوە سوڵتان سولەیمان قانونی هاوپەیمانێتیەکی لەگەڵ پاشای فەڕەنسـا فرانسـوای یەکـەم (١٤٩٤-١٥٤٧ز)دا بەسـتووە، کـە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ بـەردەوامبو، بـەگوێرەی ئـەم هاوپەیمانێتییـە، کـە خاڵەکانی لە پەیماننامەکانی دواتردا جێگیر و فراوانترکراون، لە نێو هـەمو وڵاتانی ئەوروپادا فەڕەنسا لای عوسمانییەکان بو بە خاوەن پێگەیەکی تایبەت. بەرژەوەندیی بازرگانیی بەرفراوانیشی لە شێوەی دەستکەوت و ئیمتیازاتدا پێبەخشرا.

کـۆی ئـەم پەرەسـەندنانە لـە مـاوەی هـەردوو سـەدەی پـانزە و شـانزەدا کاریگـەری لەسـەر پەیوەندییـەکانی عوسمـانی- ئـەوروپا هـەبوو، بەتایبـەت کـە عوسمانییـەکان لەسـەر ئاسـتی سیاسـی بەشێوەیەکی گەورە لەگەڵ فەزای ئەوروپیدا ئاوێتـەبوون، چـەندین وڵاتی ئەوروپی لە ئەستەمبوڵدا باڵوێزی جێگیریـان دانا، لە هەمان کاتدا سەردانی نێردراوو باڵوێزەکانی عوسمانی بۆ پایتەختەکانی ئەوروپا نەدەوەستا، ئاکامەکانی ئەم کەش و فەزایە ئەوەبوو ئیسلام کەمتر لە جاران کینەی لە دڵی ئەوروپیەکاندا دەوروژاند، لە کاتێکدا

ئیدی تورك و موسڵمان پاش ئەوەی عەرەب لەسەر شانۆی سیاسی لە دەریای ناوەڕاستدا نەمان، بوون بەوێنەی یەك شت[1].

لە ڕاستیشدا جیهان بەرەو هاوکێشەو باڵانسێکی نوێ هەنگاوی هەڵدەگرت، عوسمانییەکان بە سەرکەوتنە خێراکانیان پشکی خۆیان بەشداریان لە ئاڵوگۆڕەکانی جیهاندا کە گۆڕانکارییەکان تیایدا یەك لە دوای یەك بوو کرد. لە کاتێکدا تورکە عوسمانییەکان بەرەو هەرێمەکانی ئەوروپاو ئاسیاو ئەفریقیا پێشڕەویان دەکرد، ئەوروپای ڕۆژئاوا پێکهاتبوو لە چەندین پاشانشین و میرایەتی پەرت و بڵاو، بێ بوونی دەسەڵاتێکی سێنترالّ، هێڵی نوێی دەریاوانی بە دەوری ئەفریقادا دەدۆزییەوە کە سامان و هێزی دەگواستەوە بۆ ناوەوەی ئەوروپا. لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم و لەگەڵ دۆزینەوەی کیشوەرێکی نوێدا، وێڕای پێشکەوتنەکانی عوسمانی لە ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەوروپادا، ئیسلامی ئەندەلوسی ئاوا دەبو، سەرباری ئەو پێشکەوتنانەی عوسمانی لە ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەوروپادا. (لە ساڵی ١٤٩٢ز.دا، موسڵمانەکان لە غەرناتە دەرکران، کە دوا شوێن بو بەدەست موسڵمانەکانەوە مابو لە باشوری ئیسپانیا.و.)

سەدەی پانزە چەندین ئاڵوگۆڕی لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام شوێنەواری ئەم ئاڵوگۆڕانە تا دوو سەدە پاش ئەوە نەدۆزرانەوە. ئەوروپای ڕۆژئاوا کە لە بوارە زانستی و تەکنیکیەکاندا پێشدەکەوت لە ئامادەکردنی هێزی سەربازیدا لە ئاستی عوسمانییەکاندا نەبو، لە کاتێکدا سوڵتانی بێخەم و دڵنیا لە هێزەکەی لە هەر شەڕێکدا کە دەهاتە پیش، دەیتوانی دەیان هەزار سەرباز سازو ئامادەبکات، پاشاو میرە ناکۆکەکانی ئەوروپا لە میانی پیلان و هاوپەیمانێتی

[1] هەمان سەرچاوە، ل٥٧.

لابەلایدا ڕوبەڕوی دەبوونەوە عوسمانییەکان بەم هێزەی خۆیان ئاسوودەبوون و هەستیان بە خۆبژێویکی قوول دەکرد، بە جۆرێك لە دەرککردن بە پەرەسەندنە ڕاستەقینەکان دوریخستنەوە، کە لە ئەوروپا کۆمەڵگەیەکی نوێی لێدەهاتەبوون. تا شکستە ئاکام ترسناکەکانی ساڵی (١٦٩٩ن) عوسمانییەکان لە گۆشەگیری دەرباز نەبوون و تەماشای دەرەوەی خۆیان نەکرد. دوای ئەو مێژووە عوسمانییەکان بەیەقینەوە دواکەوتنی دەزگای سەربازی خۆیان بۆ ئاشکرابو، لەم ڕووەوە نموونەی ڕووسیا بۆ عوسمانییەکان مەغزایەکی تایبەتی هەبو، کە بەکرانەوەی بەڕوی ئەوروپای ڕۆژئاوادا توانی دەزگاکانی پەرەپێبداو کۆمەکی سوپاکەی پێبکات. ئەم بیرۆکە لە زەین و خەیاڵی چینی حوکمڕانی عوسمانیدا چەسپی، ئەوەبو لە دەستپێکی سەدەی هەژدەهەمدا هەوڵەکان بۆ کرانەوە بەڕوی ئەوروپاو زانست و کەلتورەکەیدا، بەتایبەتیش هەوڵدان بۆ ڕیفۆرمکردن لە دام و دەزگا سەربازییەکانی عوسمانیدا دەستپێکرد.

سـەردەمی (١٠) دە سـولّتانە بەراییـەکان (١٢٩٩-١٥٦٦) لـە دەوڵەتی عوسمانیدا قۆناغی هەڵکشان و گەشەکردن بوو. سەرباری ئەو شکستە ترسناکانەی ئەم دەوڵەتە لەم قۆناغەدا بەخۆیەوەبینی، لەوانـە: هەرەشـەی مـەغۆل لـە ساڵی (١٤٠٢ز) و دەستبەسـەرکردنی سـوڵتان بایەزیـدی یەکـەم لەلایـەن تـەیمورلـەنگ و نـاکۆکی کوڕەکـانی بایەزیـد لەسـەر عـەرش، کـە نزیـك بـو لـەوەی دەوڵـەت لـە نـاوەوە هەڵبتـەکێنێ، هـەروەها سـەرباری شۆڕشـە سـۆفیگەریەکەی سەماونۆیی، کە بناغەی دەوڵەتی خستە مەترسیەوە بەڵام دەوڵەت تـوانی پێشـکەوتنی سـەربازیی و گەشەسـەندنی بیناسـازیی خـۆی درێژەپێبدات. لە سەردەمی موراد‌ی دووەمەوە (١٤٢١-١٤٥١) زمـانی تورکی وەك زمـانی گوزارشـتی ئـەدەبی هاوشـان بـە زمـانی عـەرەبی و فارسـی سـەقامگیربوو. لـە سـەردەمی موحەمـەدی دووەمـی (١٤٥١-١٤٨١) جێنیشینیشـدا بایـەخێکی فـراوان بـە بینـاکردنی مزگـەوت و تـاوەرو قوتابخانـە درا. هـەروەها بایەزیـدی دووەم (١٤٨١-١٥١٢) لەسـەر بایەخـدان بـە بیناسـازی بـەردەوام بـو، هەرچـی سـەردەمی سـولەیمان قانونییـە (١٥٢٠-١٥٦٦)، کـە لـە دوایـین (١٠) سـوڵتانە بەراییەکانـە، ئـەوە بەمـەزنترین سـەردەمەکانی عوسمـانی و درەوشـاوەترینیان دادەنرێـت. لـە سـەردەمی ئـەودا دەوڵـەت بـە توانـاترین هێـزی دەریـاوانی بـوو لـە دەریـای ناوەڕاسـتدا، لـە ڕوی بیناسازیشەوە گەیشتە ترۆپکی گەشەسەندنی خۆی[1].

---

[1] بروانە بروکلمان، کارل: تاريخ الشعوب الاسلامية، دار العلم للملايين، بيروت ١٩٧٩. ص ص٤٥٨-٤٩١.

سەرەتاکانی داتەپین:

بەو هۆیەوە کە پەلوپۆ هاوێشتنی عوسمانییەکان لەسەر حیسابی سەلجوقیەکانی ڕۆمی ئەناتۆل و بیزەنتیەکان بوو لە ئەوروپا، بۆیە لە پێکهێنانی دەوڵەتی عوسمانیدا کاریگەری سەلجوقی و بیزەنتی لە ڕێکخستنی فۆرمی دەوڵەتی تازە هەڵکشاودا ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە.

دەوڵەتی عوسمانی نوێنەرایەتی فۆرمێکی سونەتیی دەوڵەتە ئیسلامیەکانی پێشوتری دەکرد، بەڵام هۆکار و هەل و مەرجەکان کە زەمینەیان بۆ گەشەکردنی خۆشکرد، مۆرکێکی تایبەت بەخۆیان پێبەخشی. سوڵتان بۆ خۆی لوتکەی دەسەڵاتی مەدەنی و ئایینی بوو، لە هەندێ بۆنەی جیاوازدا نازناوی خەلیفەی پێدەدرا. بەڵام عوسمانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا پلەو پایەی نوێیان داهێنا، لەوانە پلەی "شەیخولئیسلام" یان موفتی، کە دەسەڵاتی لەگەڵ دەسەڵاتی وەزیری مەزندا هاوشان بوو و لە ڕوی ڕیزبەندی هەرەمییەوە ڕاستەوخۆ لە دوای سوڵتان دەهات[1]. دەسەڵاتی کردارەکی "شەیخولئیسلام" بە گوێرەی دۆخەکان بەرین و فراوان یا بەرتەسک دەبو، چونکە سوڵتان خۆی دایدەمەزراند، لەگەڵ ئەوەشدا لە حاڵەتی بێباری و لاریدا فەتوایەکی ئەو بۆ لەکارخستنی خودی سوڵتان بەسبوو.

داهێنانێکی عوسمانی تایبەت، کە بە هەرحاڵ کاریگەری بیزەنتی پێوەدیار بوو، ڕێکخستنەکانی سوپا بوو، لە سەردەمانێکی زۆر زوودا هێزی ئینکیشاری-یەنیچێرییەیان (سوپای نوێ) یان

---

[1] GIBB,H.et bowen Islamic society and the west. London 1950. part.I. PP. 81-87

پێکهێنا، بۆ ئەوەی چاودێری سوڵتان بکەن و لە شەڕەکاندا ببنە یاوەری. ئەم سوپایە ژمارەیان بەخێرایی زیادیکرد، بەتایبەتیش بە گەنجی ناوچە مەسیحییە داگیرکراوەکان پڕدەکرانەوە، کە دلڕەقانە مەشق و ڕاهێنانیان پێدەکرا. ئەم شێوازە لە سەربازی پێکردن زۆر بە ڕوونی لەگەڵ بەهاکانی ئیسلامدا دژو ناتەبابوو، بەڵام بوو بە پێویستیەك کە ڕەتنەدەکرایەوە، چونکە کوڕانی عەشیرەتە تورکەکان کە لە جەنگە بەراییەکاندا لێوەشاوەییان دەنواند لە هەمان کاتدا لە ملکەچکردندا بۆ سیستمی سەربازی بێتوانایی خۆیان پیشاندا[1]. ئینکیشاریەکان ئاغایەکیان هەبو ڕۆڵی فەرماندەی دەگێڕا، پلەکەی دوای وەزیرو شەیخولئیسلام بە دووەم دەهات.

سوڵتانەکان لەمیانی پشتبەستنیان بە سوپا بە دیسپلین و ڕێکخراوەکانیانەوە، هێزو دەسەڵاتی خۆیان دەپاراست، لە قۆناغێکدا کە سەرکەوتنەکان سیمایەکی دیاری بو. بەڵام لەگەڵ کۆتایی سەردەمی سولەیمان قانونیدا سیماکانی لاوازی و داڕوخان لە ناوەوە دەرکەوتن، لە کاتێکدا دەوڵەت توانی شکۆو هێزی خۆی بەرامبەر بە دوژمنەکانی بپارێزێت. یەکەمین سیماکانی داڕوخان و داتەپینیش لە نێو کارگێڕیدا دەرکەوت، هەروەها لە نێو سوپای ئینکیشاریدا کە خەرجیەکانی ڕووی لە زیادبوون کردو دەسەڵاتیشیان لەسەر حیسابی دەسەڵاتە مەدەنیەکان تا دەهات بەرفراوانتر دەبو، لە هەمان کاتیشدا هێزو توانا سەربازیەکانیان تا دەهات ڕوی لە کزی دەکرد.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ل ٥٦-٦٥.

یەکەمین هەوڵەکان بۆ چارەسەرکرنی پرسی پاشەکشێکردنی کارگێڕی و لاوازییەکانی سوپا لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزدەهەمدا دەستیپێکرد. لە کاتێکدا دەوڵەت هێشتا لە ترۆپکی بەهێزیدابوو لە سەردەمی سولەیمان قانونیدا، لەم ڕووەوە لوتفی پاشا کە یەکێك بوو لە وەزیرەکانی پێشوتری سولەیمان، نامەیەکی نووسیوە بەناونیشانی (ئاساف نامە )[1]، تیایدا بیروڕا بەراییەکانی سەبارەت بەو پرسانە کۆکردۆتەوە، کە پەیوەندیان بە خراپبوونی دام و دەزگاکانی دەوڵەتەوە هەیە، نامەکەی کردۆتە چوار بەشەوە بەم شێوەی خوارەوە:

خەسڵەتەکانی وەزیر پێویستە چۆن بێت، دۆخی سەربازی، سەرپەرشتیکردنی خەزێنە، تەماشاکردنی کاروبارەکانی ڕەعیەت[2].

لە میانی خستنەڕووی ئەم مەسەلانەوە یەکەمین بیرۆکەکانی ئاشکرا کرد سەبارەت بە پێویستی چارەسەرکردنی ئەو لاوازییەی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی گرتبۆوە، لوتفی پاشا ئومێدی وابوو بەم نامە هەندێ پەندو وانە بۆ نەوەکانی دوای خۆی جێبهێڵێت. لە ڕاستیدا ئەوەی ئەو لە نامەکەیدا نیشانیداوە، دەبنە پرنسیپێك و لە کاتی تردا لە ماوەی سەدەی حەڤدەهەم چەندین عوسمانی تر دەگەڕێنەوە سەر باس و خواس و چارەسەرکردنی.

یەکەمین هەوڵی گرنگ، کە بەوردی و جۆرێك لە ڕاشکاوی باسی لە داتەپین و پاشەکشێی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، نووسینەکەی (قوچی بەگ)ە، کە لە ساڵی (١٦٣٠ز)دا لە شێوەی نامەیەکدا بۆ سوڵتان مورادی چوارەمی بەرزکردۆتەوە، ئامانجی لەم کارە بە پلەی یەك ڕۆشنفکرکردن و بەخشینی بەرچاوڕوونی بوو بە سوڵتان،

---

[1] لطفی باشا، اصاف نامة. مخطوط فی المکتبة الوطنیة في باریس رقم ١٠٩٢.
[2] هەمان سەرچاوە، ل ل٢-٣.

سەبارەت بە مەسەلەكانی حوكمڕانی و ناساندنی بە كاروبارەكانی كارگێڕیی لە پاش تێكچونی باری دەوڵەت لە سەرەتاكانی سەدەی حەوتەمدا[1].

قوچی بەگ یان قوچا موستەفا خەڵكی مەكەدۆنیا یان ئەلبانیا بووە، هاتۆتە ئەستەمبوڵ و لە سەرای سوڵتانیدا گەورەبووە، دواتریش بووە بە ئەندامێكی دەركەوتو لە نێو كارگێڕیی سوڵتاندا. قوچی بەگ بە حوكمی كارەكەی لەو ڕوداوانەوە نزیكبووە، كە ئەستەموڵ بەخۆوە بینیوێتی، بەتایبەت كە لە ماوەی بیست ساڵدا پێنج سوڵتان بەهۆی ناكۆكیان لەگەڵ ئاغاكانی ئینكیشاری و شەیخولئیسلامەكاندا یەك لە شوێن یەك گۆڕاون.

دووەم ڕوداوی گرنگ كە لەو ماوەدا ئەستەموڵ بەخۆیەوەبینی، ململانێی سوڵتانی مێرمندالْ (عوسمانی دووەم) بوو لەگەڵ ئینكیشاریەكاندا، ئەم ململانێیە كە بە كوشتنی ناوبراو كۆتایهات. یەكەمین جاریش بو لە چوارچێوەی دەوڵەتدا سوڵتانێك بە دەستی یاریدەرەكانی بكوژرێت[2].

عوسمانی دووەم لە ساڵی (١٦٠٣ز)دا كە ساڵی چونە سەر تەختی باوكی بوو لە دایكبووە، پاش مردنی ئەحمەدی دووەم لە ساڵی (١٦١٧ز)دا براكەی موستەفا جێگەی گرتەوە، بەڵام عوسمانی دووەم كە "شەیخولئیسلام" پاڵپشتی بوو سوودی لە لاوازیی مامەكەی وەرگرت، ئەوەبو بۆ ساڵی دواتر لایداو خۆی چووە سەر عەرش. لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتانی لاو كە ویستی بەشێوەیەكی سەربەخۆ فەرمانڕەوایی بكات، پشتگیری ئینكیشاری و زانایانی لەدەستدا، دواتریش هەنگاوە چاكسازیەكەی بووە هۆی

[1] babinger, F: art. Koci Bey. Ei1 vol. 2.P.1116

[2] kramers , J.H. :art Othman II, Ei1 Vol 4.pp.1076

قوڵکردنەوەی ململانێ لە نێوان خۆی و فەرماندە ئینکیشاریەکاندا، ئـەوەبوو ئاغایـەکی ئینکیشـاری لـە سـاڵی (١٦٢٣ن)دا لـە دژی سـەرکردایەتی ڕاپـەڕینێکی کـرد و بـووە هـۆی کوشـتنی. ڕووداوی کوشتنیشـی بـوو بـە سـەرەتایەك بـۆ نـاکۆکی و ململانـێ لەسـەر دەسەڵات لە نێوان سوڵتانەکان لە لایەك و سەرۆکەکانی ئینکیشاری لە لایەکی ترەوە.

پاش کوشتنی عوسمانی دووەم جۆرێك لە ئاژاوەو پشێوی لە ئەسـتەمبولٚ سـەریهەڵدا، هۆکارەکـەی ئینکیشـاریەکان و سـوپای (سوارەی دەرەبەگەکان) بوو، ئەمانە موستەفای یەکەمیان هێنایەوە سەر تـەختی دەسـەڵات و پاشـان دوای سـاڵێك ناچاریانکرد واز لـە دەسـەڵات بهێنێـت، ئـەوەبوو مـورادی چـوارەمی بـرای عوسمـانی کوژراویان کردە سوڵتان، کە تەمەنی یانزە ساڵان بوو. لە ڕاستیدا مـوراد لەگـەڵ براکانیـدا لـە دۆخێکـی دڵنیـادا نـەبوون، چـونکە ئینکیشـاریەکان لەسـەر دروسـتکردنی ئـاژاوەو پشـێوی و دەسـتێوەردان لـە کاروبـاری حـوکم و لادان و دانـانی وەزیرەکـان بـەردەوامبوون، لـە مـاوەی سـاڵانی (١٦٢٣-١٦٣٢ن)دا حـەوت وەزیریان لاداوە، تا ئەوکاتەی سوڵتان دەستی داری گرت و تەمەنی بوو بە بیست ساڵ، ئەوکات توانی هـەژموونی خۆی بسەپێنێت، بەتایبەتیش کاتێك هەندێك لە داروەدەستەی براکەی سوڵتان عوسمان هەندێك کاریگەرێتیان پەیداکردەوە. لە هەمان کاتدا مورادی چوارەم تـوانی هەڵوێستەکە بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی هەڵگەڕێنێتـەوە. کاتێـك توانی لە ساڵی (١٦٣٢ن)دا بەشێویەکی کارا سەرجەم تواناکانی بۆ جەنگ لە دژی فارس یەکبخات[1].

---

[1] Kramers, J. H. : art murad IV, Ei1 Vol 3pp.781-782

قوچی بەگ بە حوکمی کارەکەی لە سەرای سوڵتانەوە نزیك بوو لە کۆی ئەو ڕووداوانەوە، بێگومان ئەو پەرەسەندنانە ڕۆڵیان هەبووە لە ئاڕاستەکردنی بۆچوونەکانیدا، پاشتریش قوچی بەگ دەبێتە یەکێك لە نزیك و ڕاوێژکارەکانی مورادی چوارەم، بگرە ئەگەر گوزارشتەکە دروستبێت، بوو بە پەروەردەکاری. نامەکەشی لە ساڵی (١٠٤٠ك/١٦٣٠ز)دا بۆ بەرزدەکاتەوە و بێ پێچ و پەنا هۆکارەکانی داڕوخان و داتەپینی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ ڕاڤەدەکات. پێدەچێت ئەوەی "قوانین نامەی" بۆ مورادی چوارەم ئامادەکردووە، قوچی بەگ بێت، هەروەها نامەیەکی هاوشێوە بەڵام کەمێك لەوەی تر فروانتر بەرزدەکاتەوە بۆ سوڵتان ئیبراهیم (١٦٤٠-١٦٤٨). بەڵام کاریگەری قوچی بەگ لەسەر مێژوونوسە عوسمانییەکانی دوای خۆی دەردەکەوێت، هەرچی مردنیشی بوو، ئەوا پێدەچێت دوای ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم بوبێت بەچەند ساڵێکی کەم[1].

قوچی بەگ نامەکەی[2] کردۆتە پێنج بەشەوە لە چوار بەشی یەکەمدا ئەم بابەتانەی باسکردووە: سوڵتانە عوسمانییەکان و دارودەستەکانیان و میوانەکانیان و گەورە ئەفسەرەکان. ژمارەی زەعامەت و تیمارەکان لە کۆنداو هێزو ڕاژەکانیان بۆ دەوڵەت. ژمارەو جۆری کاربەدەستەکان و موچەکانیان لە کۆندا. ئەو پاسانەی خراونەتە ئەستۆی زانایان و ئەوانە کێن و چی دەکەن؟

هەرچی دوا بەشە ئەوا جۆرێکە لە کورتکردنەوەو دەستنیشانکردن بۆ هۆکارەکانی داتەپین و بەم ناونیشانەوە دانراوە: لاوازبوونی دەسەڵاتی وەزیرە مەزنەکان و سەرپێچیکردنەکانی

---

[1] Babinger. F.art , Koci Bey. Ei1 Vol.2 pp, 1116

[2] Canon de sultan Suleiman II. Represente a sultan murad IV pour son instruction Aparis MIDCCXXV PP.163-218

دەستوپێوەندو گۆڕانکارییەکانی لە ئاست زەعامەت و تیمارەکاندا، هۆکاری پشێوی و نائارامی لە حوکمڕانیدا.

هەرچی بیروڕاکانێتی لە نامەکەدا بەم شێوەی خوارەوە خستویەتییەڕوو:

پێشتر و تا سەردەمی سولەیمان قانونی خودی سوڵتانەکان خۆیان لە دیوانی سوڵتانیدا ئامادەدەبوون و گرنگیان بە کاروبارەکانی دەوڵەت دەدا و لێکۆڵینەوەیان لە مەسەلەکانی دەوڵەت و خەڵك و داهاتەکانی خەزێنە دەکرد، سوڵتان سولەیمان کاتێك بەهۆی سەرقاڵبوون و هەڵمەت و پەلامارەکانەوە توانای ئامادەبوونی نەدەبوو، هەمیشە هەوڵیدەدا لەڕووداوەکانی ناو دیوان بەئاگابێت. هیچ بەربەستێکی لە نێوان خۆی و خەڵکدا دانەدەنا، ئەمە وایکردبوو لە زۆرێك لە کاروبارەکان بە ئاگابێت، بەهۆی ئەو بایەخ و گرنگیپێدانەوە سەڵتەنەت بوژابووەوە.

لەو ڕۆژگارەدا دەستوپێوەندو یاوەرە نزیکەکانی سوڵتان خەڵکانێکی بەئەزمون بوون و گرنگیان بە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت دەدا، بێئەوەی دەستبخەنە نێو کارێکەوە پەیوەندی بەئەوانەوە نەبێت.

لەو ڕۆژگارەدا یاوەرە نزیکەکان بۆیان نەبوو سەبارەت بە کاروبارێك کە پەیوەندی بە وەزیرەکان یان پیاوانی یاساوە هەبوو لەگەڵ سوڵتاندا قسە بکەن. سەرجەمی ئەوانەی خزمەتکاری وەزیرەکان بوون، بەپارە کڕابوون و هیچ سکاڵایان نەدەکرد. پلەوپایەکانی بەگلەربەگی و بەگ و پلەوپایە سوڵتانییەکانی تر بەخشرابو بە کەسانێك کە لە هونەری سەربازی و حوکمڕانی و کارگێڕی هەرێمەکاندا بە ئەزموون بوون، جێی متمانە و پارێزەری شەریعەت بوون، بۆ ماوەیەکی درێژیش لە نێوان بیست تا سی ساڵدا

لە پلەکانیان دەمانەوە، ئەمەش بۆ دەوڵەت سەرچاوەی بەهێزی و تۆکمەیی بو، لە ڕۆژگاری جەنگیشدا ژمارەیەکی زۆری پیاوانی چەکداری ڕێکخراوو مەشقپێکراویان دەهێنا، لەوانەی لە چەندین بۆنەی تردا نیشانەکانی لێهاتووییان پێشاندابوو، هەروەها لە بەرینبوونی دەوڵەتەکەیشدا بەشداریان کردبووو.

لەو ڕۆژگارەدا قبودچی باشی (سەرۆکی چاودێران یا دەرگاوانەکان لە کۆشکی سوڵتانیدا) کەسانێك بوون شایستەی ئەوەبوون کە لە پلەی پاشایی یان بەگی دا بن، ئەوانە لە کاروبارەکانی دەوڵەت و جەنگدا بەئەزمون بوون و مەبەستیان سەرخستنی بنەماڵەی عوسمانی بوو، نووسەرەکانیش پیاوانی فیکربوون و لە نووسین و حیسابدا لێزان و لە یاساشدا شارەزابوون. هەروەها لە نووسینی نامەدا بۆ پاشاکانی ولاتانی دراوسێ لێهاتو بوون. هەرچی سەرپەرشتیاری تۆمارگەکانی سوڵتانی و متمانەپێکراوەکانی سەر خەزێنە بوو، زۆر بلیمەتبوون، هەمیشە نیشانەکانی نموونەیی و ڕاستپۆیشتنیان پیشاندەدا. هەرچی سوارەو پیاوە نزیکەکانی تری سوڵتان بوو، کرێ و حەقدەستی خۆیان هەبوو، زەعامەت و تیماریشیان پێدەبەخشرا.

سنووری دەوڵەت گەیشتە ولاتی فارس و مەغۆل و تەتەرو یەمەن و هیندستان، بەم دیویشدا تا ولاتی کافران (مەبەست ولاتە ئەوروپیەکانە) چووبوو، بێ ئەوەی هیچ دوژمنێکی ئاینەکە بتوانێت لەگەڵیدا بەرەنگاربێتەوە، هەموو ئەمانە بەهۆی چاکەی هێزی زەعامەت و تیمارەکانەوە بو، چونکە هێزگەلێکی هەڵبژاردە بوون و لە پێناوی بڵاوبوونەوەی ئیمان و چاکەی ولاتدا هەمیشە تەیارو ئامادەبوون. لە وەها دۆخێکدا هێزی تر پێویست نەبو، ئەم هێزانە

بەسبوون، چونکە زەعامەت و تیمار تەنها دەدرایە کوڕان و منداڵانی سوپاییە دێرینەکان.

قوچی بەگ لە نامەکەیدا ئەوەی تێبینیکردووە: لەو ڕۆژگارەدا وەزیرەکان و پیاوانی جەنگ ئەسپەکانیان بە زیو نەدەڕازاندەوە، بەڵکو تاکە خەونیان بەدەستهێنانی ئەسپ و کەوانێکی باش و هەموو جۆرە تفاقێکی جەنگیی باشبوو، تیمار و زەعامەتەکان بۆیان نەبوو لە دەرەوەی سەنجەقەکانی خۆیان نیشتەجێبن، بۆ ئەوەی هەر سوارەیەك لە جێگەو شوێنی خۆیەوە ئامادەبێت بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمن. لە بارێکدا ئەگەر شوێنی زەعامەتێك یان تیمارێك بەتاڵبوایە، ئەوا دەدرایە کەسێکی شایستە و لە تۆمارەکاندا ناونووس دەکراو پاشانیش بەرائەتی لە بابیعالییەوە بۆ دەهاتەوە.

قوچی بەگ دەگەڕێتەوە بۆ تۆمارە فەرمییەکان و دەڵێت: بەگوێرەی تۆمارەکان سوڵتان موڕادی کوڕی سەلیم (١٥٧٤-١٥٩٥ز)، موچەی داوەتە ئەم هێزانە: لەشکری سوارەو نووسەرو ئەمیندارو کوڕانی سپاهی و پۆستەچی و ئینکیشارییەکان و خزمەتکارو تۆپچی و بانگدەرەکان. ژمارەشیان دیاربوو نەزیادی کردووەو نە کەم. هەرچی ئینکیشاری و تۆپچیی و سەرجەم سوپای ئۆجاقەکان بوو، لە عەشیرەتەکانی ئەرنائوت و بوشناق و یۆنان و بولغارو ئەرمەن پێکدەهێنران، بێجگە لەمان کەسیتر بۆی نەبوو بچێتە ڕیزەکانی ئینکیشاری. ئەم سوپایە لە سەراکانی ئەستەمبوڵ دا کە بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرابوو، دابەشدەکران، لەوێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ پرۆسەی مەشقکردن و ڕاهێنان و فێرکردنیان دەبینی، پاش ئەوە دەنێردران بۆ ئۆجاقەکان، هەر حەوت ساڵ جارێکیش شوێنە بەتاڵەکان بەهێنانی ژمارەی خۆبەخشی نوێ پڕدەکرانەوە.

لەو بەشەی کە بۆ قسەکردن لەسەر زاناکان تەرخانکراوە، قوچی دەڵێت: بەگوێرەی یاسا کۆنەکان لە ڕۆژگاری سوڵتانەکانی پێشوودا پلەوپایەی موفتی و قازی عەسکەری ڕۆمللی یا ئەنەدۆل لەو جۆرە کەسانەی بۆ کاندید دەکرا، کە زۆرترین بڕی زانیاری و پتەوترین ئیمانیان بەخودا هەبوو. گەر ئەرکەکانی خۆی بەجوانی ڕاپەڕاندبایە، بۆ هەمیشە لە شوێنەکەی خۆی دەمایەوە، بە حوکمی پلە زانستیەکەیشی کە بەرزترین پلە بوو، ڕێزلێگرتنیشی جوداتربو. لە کۆنیشدا موفتیەکان بێجگە لەوەی سەرچاوەی زانست بوون، بەهیچ جۆرێك ڕاستییەکانیان لە سوڵتانەکان نەدەشاردەوە، بێپسانەوە ئامۆژگاریشیان پێشکەش دەکرد و بۆ چاکەی ئاین و دەوڵەتیش تێدەکۆشان. لە نێو پیاوانی شەریعەتدا نیشانەکانی خۆشگوزەرانی نەدەبینرا وەك ئەوەی لەمڕۆدا دەبینرێت. هەرکاتێکیش یەکێکیان لەکاربخرایە، ئەوا خۆی بۆ زانست و نووسینی چەند کتێبێك تەرخان دەکرد.

بەڵام ئەمڕۆ زانست نەماوەو یاساکانیش هەڵگەڕاونەتەوە، ئەگەر کەسێك حەزی لە فێربوون بوایە، لای زانایەکی شەریعەت دەچووە بەر خوێندن، پێویستبوو لەسەری ماوەیەك بخوێنێت، پاش ئەوە پلەیەکی ڕێگەپێدانی پێدەبەخشرا و دواتریش دەچووە لای زانایەکی تر و یەکێکیتر، بەو چەشنە پلەیەکی پێدەدرا و لە ڕۆژنامەی سوڵتانیدا ناوی تۆماردەکرا. بەم جۆرە لە نێو ئەوانەدا کەسێکی نەزان و نامۆ نەدەبینرا. بەڵام ئەم سیستەمە لە دوای ساڵی (١٥٩٤/١٠٠٣ز)دا هەڵگەڕایەوە، عەلا ئەفەندی بێ هیچ هۆیەك لە فەتوادان لایاندا، هەمان شت بەسەر قازی عەسکەردا هات. لێرەوە بۆ پاراستنی پلەوپایەکانیان و نزیکبوونەوە لە وەزیرەکان ئیدی ناچاربوون ڕاستییەکان لە سوڵتان بشارنەوە. بەم دواییانەش پلەی

موفتی و قازی عەسکەر درانە خەڵکانێکی نەزان و بێتوانا، پێچەوانەی ئەو یاساو نەریتانەی کە پێشتر پەیڕەودەکران، پەتای پلەوپایە فرۆشتن گواسترایەوە بۆ نووسەرە نەزانەکان و ئەوانەی بەهۆی پارەوە دەبوون بە مامۆستاو قازی. ئەم سەرپێچییانە بڵاوبوونەوەی نەزانینی ئاسانکرد کە لە ئەمڕۆدا باڵادەستەو ناشتوانین باش لە خراپ جیا بکەینەوە، ئیدی ستەمکاری و زەوتکردنی سامان و موڵکی گشتی لێرەوە سەرچاوەدەگرن.

لە کۆندا فەقێ ئایینیەکان شەریعەتیان ئەزبەربوو، خەونیشیان یەکسانی بوو، چونکە لە خوداترس بوون، خەڵکیش خۆشیدەویستن، لە ماڵ دەرنەدەچوون گەر بۆ سەردانی مەکتەب و مزگەوتەکان نەبوایە یان بۆ سەردانی پیاوچاکان، بە بەردەوامیی سەرقاڵی وەرگرتنی زانست بوون. ئەوەی کە ئەمڕۆ بزان لە نەزان جیادەکەینەوە، ئەوەیە جارێ ئومێدی ڕیفۆرمکردنمان هەیە. چونکە ناکرێت پلەوپایەی زاناکان بە فرت و فێڵ و بەزەیی بدرێتە نەزانەکان.

لە کۆتایی نامەکەیدا قوچی بەگ هۆکارەکانی داتەپینی دام و دەزگاکانی دەوڵەت کورتدەکاتەوە:

وەزیرە مەزنەکان تا ساڵی (٩٨٢/١٥٧١ز) دەسەڵاتێکی ڕەهایان هەبوو، لەمان زیاتر کەسیتر لە سەرای یا دەرەوەیدا دەستی نەدەخستە کاروبارەکانی دەوڵەتەوە. لە سوڵتان زیاتر بایەخیان بە کەسیتر نەئەدا، بەڵام لەوکاتەوە یاوەرە نزیکەکانی سوڵتان ڕێگەیان بۆ خۆشبووە دەستبخەنە ناو کاروبارەکانی دەوڵەت و داواکاری نابەجێ لە وەزیرە مەزنەکان بکەن، ئەوەشی بەگوێی نەکردنایە، هەزار قسەیان لە بارەوە دەهێنایە بەرگوێی سوڵتان. ئەوانە زۆرجار هۆکاری بێنەوایی وەزیرەکان بوون، هەندێ لە وەزیرەکان بێئەوەی

تاوانباربن حوکمی مردنیان بەسەردا سەپێندراوە، هەندێکی تریان لەکارخران یان دورخرانەوەو موڵکەکانیان دەستی بەسەرداگیرا.

لە سایەی حوکمڕانی سوڵتان موراد و سوڵتان موحەممەددا، سوپایی کە بە هاوکاری هەندێ لە وەزیرەکان ڕاپەڕین، بوونە سەرچاوەی چەندین ستەم و زوڵم لە دژی پیاوچاکان، بەچەشنێك وەك نیمچە مەحاڵێك دەردەکەوت ئەو نائارامی و پشێوییە کۆتایی پێ بێت. بەڵام حەسەن پاشا، کە پیاوێکی لێزان و دڵسۆز بوو، ئینکیشاریەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو لە پڕێکدا دەرگاکانی ئەستەمبوڵی داخست و ملی پیاو خراپانی بڕی و دۆخەکەی ئارام و هێمن کردەوە. بەڵام لای سوڵتان هەزار تۆمەتیان بۆ دروستکرد، کە ئاکام بە کوشتنی کۆتایی هات. نەسوح پاشاو دەرویش پاشا هەمان چارەنووسیان توشبوو، کە هەردووکیان لە وەزیرە بەئەزموون و ئەمینەکان بوون، هەردوکیان تۆمەتبارکران بەوەی گوایە بەنیازبوون سوڵتان بکوژن، ئەم تۆمەتەش بۆ کوشتنیان بەسبوو، لە کۆتاییدا ئەم نموونانە وەزیرەکانی ناچارکرد کە سەرجەم داواکاریی یاوەرە نزیکەکانی سوڵتان جێبەجێبکەن و داواکانیان ڕەتنەکەنەوە. خودی یاوەرە نزیکەکانی سوڵتان خۆیان بوون، کە دەستیاندەخستە ناو کاروبارەکانی دەوڵەت و بەناوی "بەشمەلیك" و "ئەربەلیك"وە دەبوونە خاوەنی چەندین گوندو زەوی و زارو چەندین زەعامەت و تیماریان زەوتکردو دەیانبەخشیە خولام و خزمەتکارەکانی خۆیان، ئەمەش بووە هۆکاری داڕوخان و سڕینەوەی ژمارەیەکی زۆری زەعامەت و تیمار، بەتایبەت ئەوانەی خزمەتی مەزنیان پێشکەش بە دەوڵەت کردبووو، ئەم جۆرە لە خەڵکی سەرچاوەی نائارامی و پشێوین، کە وەك دەبینین بەبەردەوامیی دوبارەدەبێتەوە.

قوچی بەگ نامەکەی بە دەستنیشانکردنی ئەو ڕێگەچارانە کۆتایی پێدێنێت کە پێیوایە بۆ بەرگرتن لە خراپبوونی دۆخەکە گونجاون: پێویستە ئەم هێزانە لەگەڵ هێزی تردا تێکەڵ بە سوپا بکرێن، هەرچی خزمەتکارەکانن، پێویستە لەو کۆیلەکان بن کە بەگوێرەی یاسا کۆن و نەریتە پەیڕەوکراوەکان سەندراون، چەندین خەڵکی قەرەج و جوو و خەڵکانی تری قێزەوەن کە بێ بڕواو بێ شەریعەتن، هاتونەتە نێو کۆشکی سوڵتان. ئەگەر ئەم پاشاگەردانییانە چارەسەر نەکرێن و لە دابەشکردنی تیمارو زەعامەتەکاندا خەڵکی شایستە پێشنەخرێن، ناتوانین هێرشی سەربازیی شایستە بە دەوڵەت و ئایین ئەنجام بدەین.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوە بیروڕاکانی قوچی بەگ بوو، کە لە نامەکەیدا هاتبوو، کە تیایدا جەختی لە ڕەخنەگرتن لە ڕەفتارە هەڵەکان کردۆتەوە، ئیدی سەرچاوەکەی هەر کەسێك بێت، سوڵتانەکان یان وەزیرەکان، هەروەها ڕەخنەی لە دام و دەزگا سەرەکییەکانی دەوڵەت گرتووە، کە بریتین لە دەزگاکانی حوکمڕانی و کارگێڕی و سوپاو زانست.

بیروڕاکانی قوچی بەگ لە ڕاڤەکردنیدا بۆ هۆکارەکانی پاشەکشێ و داتەپین بەم شێوەی خوارەوە کورتدەکرێنەوە:

سانسۆرنەکردنی وەزیرەکان لەلایەن سوڵتانەوەو پێشکەشکردنی پلەوپایەو دەستکەوتەکان بە خولام و دارودەستەکەی و نادڵسۆزی وەزیرەکان، بەجۆرێك بەرژەوەندیەکانی خۆیان خستبووە پێش بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتەوە. وێرانبوونی کەرتە سەربازیەکان، کە سەرچاوەی دارایی و هێزی جەنگاوەری دەوڵەت بوون. لە کۆتاییشدا گەندەڵبوونی پیاوانی ئایینی و دەزگا فێرکاریەکان.

**بیروباوەڕەکان لە پێناو ڕیفۆرمدا**

نامەکەی قوچی بەگ تەنها نامە نەبوو باسی ئەم مەسەلانەی کردبێت، دوای چەند ساڵێکی کەم حاجی خەلیفە کە ئەویش بە کاتب چەلەبی (١٦٠٨-١٦٥٧) ناوی دەرکردبووو، لە دیارترین نووسەرە عوسمانییەکان بوو[1]، لە ساڵی (١٦٥٣ز)دا نامەیەکی هاوشێوەی بەم ناونیشانە: "دەستوری کار بۆ چاککردنی دۆخی نالەبار" بۆ سوڵتان موحەممەدی چوارەم (١٦٤٨-١٦٨٧)ی بەرزکردۆتەوە. حاجی خەلیفە نامەکەی لەسەر داخوازی خودی سوڵتان نووسیوە، دوای ئەوەی داوای لە یاریدەرەکانی کردبووو لە هۆکارەکانی قەیرانی دارایی و کەمی داهاتی دەوڵەت و کورتهێنانی خەرجییەکان بکۆڵنەوە، بەم جۆرە حاجی خەلیفە ڕاپۆرتەکەی بەرزکردەوە. بەهۆی ئەوەی خۆی کارگێڕی دەوڵەت بوو، دەستنیشانکردنی بۆ هۆکارەکانی داتەپینی و پاشەکشێی دارایی و سەربازیی و کارگێڕیی لە دەوڵەتی عوسمانیدا جێی بڕوابوون[2].

نووسەر سەرەتا هۆکاری نووسینەکەی ڕووندەکاتەوە و دواتر بەسوودوەرگرتن لە ڕاڤەکردنی خەلدونی بۆ مێژووو هەندێ بیروڕا دەربارەی دروستبوونی دەوڵەتان و داڕوخان و داتەپینیان دەخاتە ڕوو. حاجی خەلیفە ئاماژە بۆ ئەوەدەکات هاوشێوەی تاکەکان دەوڵەتانیش بەسێ قۆناغی جیاوازدا تێپەڕدەبن: گەشەکردن، وەستان و دواتر داڕوخان و داتەپین، پێیوایە دەوڵەتی عوسمانی ماوەیەکی درێژ ژیاوەو قۆناغی وەستانی بە ئارامی تێپەڕاندووەو لە میانەی چەند دەرکەوتەیەکەوە سیماکانی قۆناغی سێیەم

---

[1] Gokyas, O,S:art Katib gelebi Ei2 Vol 4. pp. 791-792

[2] Lewis,B.ottoman obsers of ottoman decline J. C.I. I. R. vol.1 1962. pp.71-77

دەرکەوتوون، بۆیە پێویستە ڕێگەچارە بۆ قەیرانەکان بدۆزرێنەوە، بۆ پاڵپشتکردنی بیروڕاکانیشی لە سێ بەشدا باس لە بوارەکانی کشتوکاڵ و سەربازیی و خەزێنە دەکات.

حاجی خەلیفە بۆچوونی وابووە کە لە ماوەی ڕابووردودا سوڵتانەکان هەوڵیانداوە جوتیارەکان لە ستەم و گوشارەکان بپارێزن، بۆیە هیچ کام لە گوندەکان کاول و وێران نەدەبوون، بەڵام لە قۆناغەکانی دواتردا هەندێك لە جوتیارەکان دەستیان لە سەرچاوەکانی بژێوی خۆیان هەڵگرت و کۆچیان کرد بۆ شار، لە ئێستاشدا ئەستەمبوڵ پڕە لە زۆرێك لەوانە، لە ساڵی (١٦٢٢ن) تا ساڵی(١٦٣٤ن) زۆرێك لە گوندەکان وێرانبوون، هۆکاری ئەوەش ڕوون و دیارە، وێرانبوونی گوند لە دەوڵەتی عوسمانیدا هۆکارەکەی باجە زۆرەملێکانە و سەربازەکان بۆ خۆیان باجە قورسەکان دەسەپێنن و جوتیارەکان ناچار بەپێدانی دەکەن، ئەگەر ئەم دۆخە چارەسەر نەکرێت، ئەوا بێگومان لەعنەتی یاخیبوون و سەرپێچیکردنی یاساو وڵات بەرەو وێرانبوون دەبەن.

پاشان حاجی خەلیفە باس لە کاروبارە سەربازیەکان دەکات و جەخت لە بەرزبوونەوەی خەرجیەکانی دەکاتەوە، کە بەراورد لەگەڵ ڕۆژگاری سولەیمان قانونیدا زۆر زیادیکردووە. دواتریش دێتەسەر باسی خەزێنە کە دەیشوبهێنێت بە گەدە لە جەستەی مرۆڤدا، بە جۆرێك بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یا ناڕاستەوخۆ سەرجەم بەشەکانی پێوەگرێدراوە. بەهۆی ئەوەی کشتوکاڵ وێرانکراوە، خەزێنەش بەتاڵ بووە، ئیدی ئەوە کاری کردۆتە سەر تێکڕای جەستەی کۆمەڵگە. لە نیشانەکانی پیریش تەمبەڵیی و هەرس نەکردنە، حاڵی دەوڵەتانیش وایە، هەرچۆن لە پیربووندا مرۆڤ قژی سپی دەبێت، هەمان شت سەبارەت بە دەوڵەتانیش ڕاستە، پاش

تێپەڕبوون بە قۆناغی داتەپیندا بەفیڕۆدان و مەزنیی پەرەدەستێنێ، نازناوەکان زۆردەبن، تەنانەت خۆشوبهاندنی خەڵکی لە جل و بەرگ و کەرەستەکانی ناو ماڵیاندا بە پاشا زۆردەبێت، لەوێشەوە سامان بەفیڕۆدان و بەدمەسرەفی بەرزدەبێتەوە.

ناوبراو چوار ڕیفۆرم بە چارەسەری گونجاو دەزانێت: یان لە میانەی خاوەن شمشێرەوە، ڕاوێژکارانی دەوڵەت، گەورە ئەفسەران، بریکارەکانی دەوڵەت. بەڵام سێ ڕێگەی کۆتایی بەدووردەزانێت و چاوەڕێی دەکات خاوەن شمشێر هەڵسێت بە ئەنجامدانی ڕیفۆرم. بەگوێرەی نووسەر یەکەمین ئەرکەکان بریتین لە: دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ کورتهێنانی خەزێنە، کەمکردنەوەی قەبارەی سوپا، سنووردانان بۆ زیادەڕۆیی لە خەرجکردندا وچارەسەرکردنی دۆخی هەژاریی لای جوتیارەکان، لەگەڵ ئەمانەشدا نووسەر گەشبین نەبوو بە ئەنجامدانی ڕیفۆرم.

لەم چوارچێوەدا هەوڵەکانی حسێن هەزار فەن (١٦٠١-١٦٧٩) لە کتێبەکەیدا "کورتەی بەیان لە یاساکانی بنەماڵەی عوسمان"دا دەردەکەوێت، ئەمیش جەخت لەو مەسەلانە دەکاتەوە، کە پێش خۆی هەر یەك لە قوچی بەگ و حاجی خەلیفە ئاماژەیانپێداوە، بەڵام زۆر ڕەقتر ڕەخنەی خۆی ئاڕاستەی بەرپرسانی داتەپین دەکات، ڕەخنەکانی سوڵتانەکانی عوسمانیش لە دوا قۆناغەکانی دەوڵەتەکەدا دەگرێتەوە، هەروەها ئاماژە بۆ گەندەڵیی وەزیرە مەزنەکان و خراپیی هەڵس و کەوتی ئەفسەرەکان کردووەو جەختی لەوە کردۆتەوە کە پێویستە پلەو پایەکان لە ویلایەتەکاندا بدرێت بە کەسانی شایستە. بەگوێرەی حسێن هەزار فەن پێویستە سوڵتان پشت ببەستێت بە دەستەیەك لە پیاوان کە وەك یەك چاودێری ڕەعیەت و دوژمن بکات، هەروەها دەبوو لە بەکارهێنانی ئەو

یاسـایانەدا کـە دەبنـە پاڵپشـتی هەمیشـە بـۆ دەسـەڵاتەکەی، دوودڵ نـەبن. هـەروەها پێویسـتە سـوڵتانەکان ملکەچـی شـەریعەت بن، بـێ گەڕانەوەش بۆ شەریعەت هیچ کەس نەکوژن، هەروەها پێویستە ئەو ئەفسـەرو کاربەدەسـت و زانایانـە سـزابدرێن، کـە بێگـوێ و کەمتەرخەمبوون. نرخێکی گەورەش بۆ ئەو بەرپرسیارێتییە ڕۆحییە دابنرێـت کـە خراوەتـە ئەسـتۆی "شەیخولئیسـلام" و عولـەما یـان زانایـان، بـەهۆی ئـەو خۆشـگوزەرانیەی بـۆ دەوڵـەت و ڕەعیـەتی دابیندەکەن [1].

حسێن هەزار فەن ئەم کتێبەی لە ساڵی (١٦٩٩ن)دا داناوە ساری موحەممەد پاشایش وەك درێژەدانی نووسینی عوسمانی سەبارەت بـە داتـەپین لـە سـاڵی (١٧٠٣ن)دا لەسـەر هـەمان بابـەت کتێبـی "ئامۆژگـاریکردنی وەزیـرو میرەکـان"ی نووسـیوە، شـایەنی هێمابۆکردنـە نـاوبراو شـتێکی نـوێی لـەم چوارچـێوەدا زیادنـەکردووە [2]. بـەڵام کتێبەکـەی لـە کاتێکـدا نووسیوە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە قۆنـاغی پاشەکشـێ و داتـەپینی ناوەکیـەوە گواستبوویەوە بۆ شکستی سەربازیی لە ئاست دوژمنەکانیدا [*].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٨١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٨٢.

[*] دوای زنجیرەیەك شەڕو ناکۆکی لە نێوان عوسمانییەکان و نەمسا، لەسەر وڵاتی مەجەر کە لە زۆربەیاندا عوسمانییەکان دەدۆڕان، هەروەها پاش دەرکەوتنی ڕووسیا لە گۆڕەپانی شانۆی نێودەوڵەتیدا، کە ویستی وابوو لەسەر حیسابی عوسمانییەکان هەژمونی خۆی بگەیەنێتە ڕۆژهەڵات و دەروازەیەکی دەریایی بەدەسبێنێت (ڕووسەکان لە سەردەمی پیتەری گەورەوە قەڵای ئازۆفیان گرت). ئاکام لە کانونی دووەمی ساڵی (١٦٩٩ن)دا، بەنێوانکاری بریتانیا و هۆڵەندا "پەیماننامەی کارلۆڤیتز" لە نێوان عوسمانییەکان لە لایەك و هەر یەك لە نەمساو ڕووسیاو بووندوقییەو پۆڵندە لە لایەکی تر، مۆرکرا. تیایدا عوسمانییەکان دەستیان لە تەواوی وڵاتی مەجەر و ترانسلڤانیا بۆ نەمسا هەڵگرت، هەروەها لە تەواوی بۆدۆلیا و ئۆکرانیا بۆ پۆڵەندە، شاری

**لە داڕوخان و داتەپینەوە بۆ شکست**

شکستی کارلوڤتز (١٦٩٩ز) بوو بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی خاکێکی پان وبەرین لەوانە ترانسلڤانیا و مەجەرو سلۆڤانیاو کرواتیا بدۆڕێنێت[1]، ئەم شکستە کە بێتوانایی سوپای ئینکیشاری ئاشکراکرد، ڕاستی و دروستی پێشبینیەکانی بیرمەندانی عوسمانی، ئەوانەی جەختیان لە پێویستی ئاوڕدانەوە لە پاشەکشێ و داتەپین دەکردەوە سەلماند.

ئاکامی جەنگ و شکست لە کۆتایدا یەخەی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم (١٧٠٣-١٧٣٠)ی گرت، کە بۆخۆی بە سروشت مەیلی بەلای ئاشتەوایدا دەڕۆیشت، ئەوە باشترین شتێك بوو دەوڵەت لە دۆخی لاوازبووندا پێیبگات، بۆیە لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵاتدا هەوڵەکانی بۆ بەدیهێنانی ئاشتەوایی لەگەڵ وڵاتە دراوسێکانیدا خستەگەڕ، بەڵام پرۆژەکەی بۆ بەدیهێنانی ئاشتەوایی نەهاتەدی تا دوای شکستێکی تر، کە بە "پەیماننامەی بازارۆیتز" کۆتایهات و تیایدا عوسمانییەکان دەستیان هەڵگرت لە بەلگرادو چەند موڵك و زەویوزارێکی دەورووبەری دانوب بۆ نەمسا [2].

ئەو دوو شکستە لە ماوەی بیست ساڵدا ئەوەی سەلماند، کە هێزێکی نوێ لەسەر شانۆی ڕوداوەکان دەرکەوتووە سەنگی خۆی هەیە، ئەویش هێزی ڕووسیایە. چینی حوکمڕانیش لە ئەستەمبوڵ

---

"ئازۆف"یش درایە ڕووسیا، هەروەها دەستیان لە نیمچە دورگەی مۆرە تا ڕوباری هکساملیۆن و هەرێمی دەلماسیا لەسەر دەریای ئەدریاتیکی بۆ بووندوقیە هەڵگرت. (وەرگێڕ).

1 SHAW , S. J :History of ottoman empire, volume 1 p. 224

2 Bowen , H :art ahmed III. Ei2, Vol.1 pp. 276-279

دا دەرکیـــان کردبـــوو ڕووســـیا، کـــە پێشـــتر مەســـەلەیەك بـــوو پشـــتگوێخرابوون، توانیـــان بەســـوودوەرگرتن لـــە چاکســـازیەکانی پیتـــەری گـــەورە(١٦٧٢-١٧٢٥) لـــە بوارەکـــانی ســـەربازیی و دام و دەزگاکـــانی دەوڵەتـــدا هێـــزو توانـــا دەســـتەبەربکەن. عوسمانییـــەکان هـەروەها هەستیانکرد دەتوانرێت ئەو هۆکارو ئامرازانە وەربگیرێت کە ڕووسەکان بۆ بەهێزکردنی خۆیان سوودیان لێوەرگرتووە. ئەگەر پیتەری گەورە لە کردنەوەی دەرگاکاندا بەڕووی کاریگەرییە نوێکانی ئەورووپا ئەنجامی هەستپێکراوی وەدەستهێناوە، ئەوا لەو کاتەوە کرانـەوە بـەڕووی پێشـکەوتنی ئـەورووپا لای ڕۆشـنگەرو هەنـدێ لـە سوڵتان و وەزیرەکانی عوسمانی بوو بە چەمکێکی سەقامگیر.

ئەگـــەر شکســـتی عوسمانییـــەکان لـــە کۆتاییـــەکانی ســـەدەی حەڤدەهـەم و سـەرەتاکانی سـەدەی هەژدەهەمـدا ئـەوەی سـەلماند کـە کرانەوە بەڕووی ئەورووپادا کارێکە پشتگوێ ناخرێت، ئەوا پێش ئەو مێـژووە بەماوەیـەك، کـە کـەم نـەبو کاریگەریـەکانی ئـەورووپا خۆیـان خزانـــدبووە نێـــو دەوڵـــەتی عوسمانییـــەوە، بـــەجۆرێك هـــەمو عوسمانییەکان لە پێشکەوتنەکانی ئەورووپا لە بوارەکانی سەربازی و دەریاوانی و بازرگانی و بیناسازیدا بێئاگانەبوون.

له كاتێكدا هەندێ لە عوسمانییەكان سەرقاڵی چارەسەركردنی مەسەلەكانی پاشەكشێ و داتەپینی دەوڵەت و دام و دەزگاكانی بوون، كەسانێكی تر هەبوون چاودێری هەندێ لە سیماكانی پێشكەوتنی ئەوروپایان دەكرد. جێی سەرنجە عوسمانییەك لە ساڵی (١٦٥٢ز)دا، ئەوەی تێبینیكردووە كە پێشكەوتنی ئەوروپا لە بوارەكانی دەریاوانی و بازرگانیدا كاریگەریی نەرێنی بۆ سەر بازرگانی موسڵمانەكان دەبێت، ئەم عوسمانییە ڕۆشنگەرە هەر زۆر زوو ئەوەی هەستپێكردبووو ئەگەر بێتو ئەوروپا لەسەر ئەم چونەپێشەوە بەردەوامبێت و موسڵمانەكانیش پاڵی لێبدنەوەو لێی بێئاگابن، ئەوا بێگومان لە ماوەیەكی كەمدا عوسمانییەكان بۆردەدەن. عومەر تالیب دەڵێت: "ئەمڕۆ ئەوروپییەكان تێكڕا جیهان دەناسن، كەشتیەكانی خۆیان ڕەوانەی سەرجەم شوێنەكان دەكەن، دەگەنە بەندەرە گرنگەكانی جیهان، پێشتر بازرگانەكانی هیندستان و سیندو چین وەك عادەتێك هەمیشە دەهاتن بۆ سوێس، شمەكەكانیشیان لە ڕێگەی موسڵمانەكانەوە بە سەرجەم جیهاندا بڵاوەپێدەكرا. بەلام ئەمڕۆ ئەم شمەكانە بە كەشتیە پورتوگالی و هۆڵەندی و ئینگلیزیەكان دەگوازرێنەوە بۆ فەرەنساو لەوێشەوە بە سەرجەم جیهاندا بڵاودەكرێتەوە. ئەوەی لە پێویستی خۆیانیش زیادە، دەیهێنن بۆ ئەستەمبوڵ و شوێنانی تر و بە پێنج هێندەی نرخی ڕاستەقینەی خۆی و زیاتر دەیفرۆشنەوە. بەو چەشنە پارەیەكی باش وەدەستدێنن، هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ئاڵتون و زیو لە وڵاتە ئیسلامیەكاندا ببن بە مادەیەكی دەگمەن و ناوازە.

پێوستە دەوڵەتی عوسمانی دەست بەسەر کەنارەکانی یەمەن و ئەو بازرگانییەدا بگرێت، کە بەوێدا دەڕۆن، ئەگەرنا زۆری پێناچێت ئەوروپییەکان ولاتانی ئیسلام داگیردەکەن"[1].

## وێنەی جیهان

پێش ئەوەی عومەر تالیب تێبینییە قووڵەکانی خۆی بنوسێتەوە، دۆزینەوە جوگرافییەکان سەرنجی عوسمانییەکانی ڕاکێشابوو، پێدەچێت ئامانجە سەربازیەکانی دەریاوانی عوسمانی لە پشت ئەم گرنگیپێدانەوە بێت[2]. بەهەرحاڵ دۆزینەوەی ئەمریکا جۆرێك لە حەز بە زانین و فزوڵی وروژاند، یەکێك لە دەریاوانە عوسمانییەکان، کە ناوی کەمال ریس بو، زانیاری سەبارەت بە دۆزینەوەکانی ئیسپانیاو پورتوگال بۆ دورگەکانی ڕۆژئاوای هیند کۆکردۆتەوە، ناوبراو لە ڕێگەی دەریاوانێکەوە لە گالیبۆلی لە ساڵی (١٥١٣ز)دا توانی کۆپییەکی ئەو نەخشە بەدەستبهێنێت، کە کریستۆفەر کۆلۆمبس لە گەشتەکەیدا بۆ ئەمەریکا بەکاریهێنابوو، لە ساڵی (١٥١٧ز)دا، واتە لەو ساڵەدا کە سوڵتان سەلیم لە قاهیرە بووە، پێشکەشی کراوە[3].

هەمان ئەو دەریاوانە عوسمانییە کتێبێکی بە ناونیشانی "بحریت" نووسیوە کۆمەڵێك زانیاری تیادا بەکارهێناوە، کە سەرچاوەکانی ئەوروپین. بەڵام کارێکی گرنگ کە حاجی خەلیفە لە ساڵی (١٦٥٤ز)دا ئەنجامیداوە وەرگێڕانی کتێبێکی ئەتڵەسی بچوك بووە بە ناونیشانی "شەوقەکانی نور لە تاریکی ئەتلەسی

---

[1] Lewis,B:the Emergence of modern Turkey, London 1961.P.34

[2] بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، ل.٤٨٣.

[3] Adnan, A: La Science chez les turcs ottomans, Paris 1939, P.60

مینور"دا[1] بۆ زمانی تورکی، بە هاوکاری فەرەنسیەك، کە بوبوو بە موسڵمان بەناوی "ئیخلاسی شێخ موحەممەد ئەفەندی"، ئەم ئەتلەسە وێنەیەکی نوێی لەسەر جیهانی هاوچەرخ بەخشییە تورکەکان. دوای حاجی خەلیفە ئەبو بەکری کوڕی بەهرام دیمەشقی (لە ساڵی ١٦٩١ مردووە)، "ئەتلەسی گەورەی" وەرگێڕایە سەر زمانی تورکی، ئەم وەرگێڕانە لە ساڵی خایاندوە، لە نێوان ساڵانی (١٦٧٥ بۆ ١٦٨٥)و لە کۆتایدا ئەم ناونیشانەی بۆ داناوە " جوگرافیای گەورە یان سەرخستنی ئیسلام و شادی لە نووسینی ئەتلەسی مینور"دا وەرگێڕانەکەی تیۆریا گەردوونیە نوێیەکانی لەخۆگرتبوو، لەوانە تیۆریاکەی کۆپەرنیك، کە یەکەم جاربوو بەشێوەیەکی کورت بەڵام بە تورکی بخرێتەڕوو[2].

بێجگە لە گرنگیدان بەدۆزینەوە جوگرافیەکان، لە ئەستەمبوڵ دا مەیلی ئاراستەیەك بۆ زانینی مێژووی ئەوروپا وەدەرکەوت. لەم ڕووەوە دەستنووسێك هەیە کە مێژوویەك لە سەرەتاوە تا ساڵی (١٥٦٠ز) لەخۆدەگرێت، هەروەها ئیبراهیم مەلهەمی (ساڵی ١٦٥٠ز. مردووە) کتێبێکی بەناونیشانی "مێژووی پاشاکانی ڕۆم و فەرەنگ" نووسیوە، بەڵام ئیبراهیم پاشا زۆر گرنگی نەداوە بە مێژووی جیهانی، بەڵام داوای ناسینی مێژووی نەیارودوژمنانی کردووە و ئەوەی بە کارێکی پێویست زانیوە[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٢٢.

[3] lewis. B: the use by muslim historians of non-muslim sources. Asia-Africa series of modern hstories. London. 1962. Vol. 4. PP.180-191

بەڵام حسێن هەزار فەن کە خاوەن کتێبی "کورتکردنەوەی بەیان لە یاساکانی بنەماڵەی عوسمان"، گرنگیەکی زۆر تایبەتی بە ئەوروپا داوە، پەیوەندی هاورێیەتی لەگەڵ هەندێك لە ئەوروپیەکانی ئەستەمبوڵ دا پێکهێناوە لەوانە "ئەنتوان گالان"ی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی. هەزار فەن مێژوویەکی گەورەشی نووسیوە ئەویش "جامع التواریخ"ە، کە تیایدا سەرچاوەی یۆنانی و لاتینی بەکارهێناوە، بەهۆی نەزانینی زمانیشەوە پشتی بەو وەرگێڕانانە بەستووە کە لە بابیعالیدا بوون[1].

لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا کتێبێکی گرنگ بە زمانی عەرەبی دەرچوو، ئەویش " جامع الدول"ی مێژوونوسی تورك "مونەجیم باشی"یە، کە لە ساڵی (١٧٠٢ز)دا مردووە، تیایدا چەند بەشێکی بۆ مێژووی وڵاتانی ئەوروپا تەرخانکردووەو لە نووسینیدا پشتی بە سەرچاوە ئەوروپیەکان بەستووە[2]. ناوبراو سەبارەت بە تێکڕای گەلانی فەرەنگ و لەسەر پاشاکانی فەرەنساو ئەڵمانیاو ئیسپانیاو تا سەردەمی لویسی سیانزەی پاشای فەرەنساو لیۆپۆڵدی پاشای ئەڵمانیاو شارلی پاشای ئینگلتەرا قسەیکردووە. هەندێ سەرچاوەی تری لە بارەی هەندێ ڕوداوی ئەوروپی بەدەستهێناوە لەوانە جەنگی ناوخۆ لە ئینگلتەراو لە سێدارەدانی پاشا[3].

کەڵەکەبوونی ئەم زانیاریانەی لە میانەی سەرچاوە جۆراوجۆرەکانەوە لای عوسمانییەکان سەبارەت بە بارودۆخی ئەوروپا، وێنەیەکی لای چینی حوکمڕانی عوسمانی پێکهێنا. ئەم

---

[1] Menage, V. L: art. Husayn Hezarfenn. Ei2, Vol 3.P. 644.

[2] Lewis, B: the use by muslim: P: 187.

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٨٧.

گرنگیدانـە، کـە عوسمانییـەکان لەسـەر ناوچـەکانی دەورووبـەریان و مێژووی وڵاتانی ئەورووپا پیشانیاندا، وێڕای ئەوەی سنووردرابوو، بەڵام بۆ موسڵمانەکان بەگشتی نوێ بوو. ئەم زانیارانە پلە بە پلـە زەمینـەی بـۆ قبـوڵکردنی بیرۆکـەی باڵادەسـتی ئـەورووپی خۆشـکرد، کـاتێکیش لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی حەڤدەهەمـدا شکسـت ڕوویـدا، ئیدی بـۆ کرانـەوە بـەڕووی ئـەورووپادا ئاقارەکـان دەرکـەوتن و زۆری پێنەچو ئاکامی هەستپێکراویان ئاشکرابوو.

## ئەوروپا وێنەی پێشکەوتن

کـارێکی سـەرەکیی کـە سـوڵتان ئەحمـەدی سـێیەم و وەزیرەکـەی ئیـبراهیم دامـاد پاشـا (١٧١٨-١٧٣٠) هـەوڵیان دا بـۆ بـەدیهێنانی، ئاشـتەوایی و هانـدانی شـاعیران و ئـەدەب دۆسـتان و پێکهێنـانی پەیوەندی بوو لەگەڵ پایتەختەکانی ئەوروپا، هەروەها شوێنکەوتن و لاسایکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و بیناسازیان بوو[١].

سوڵتان و وەزیری ناوبراو لەو بڕوایەدابوون، کە پێویستە سوود لە سیماکانی پێشکەوتنی ئەورووپی وەربگیرێت، بەتایبەتی لـە بواری سـەربازی دا، لـەو سـۆنگەوە لـە ڕۆژگـاری حوکمڕانی ئەوانـدا هـان و دنـەی بزاڤـی وەرگێـڕان لـە زمانـە ئەورووپیەکانـەوە دەدرا، ئیـدی

---

[١] ئەم قۆناغە بە سەردەمی تەولیب ناسراوە، چونکە ڕواندنی ئەم جۆرە گوڵە گەشەیکردبووو، لەهەمان کاتدا هێمای گەشەکردنی شیعر و ئەدەب بوو. ( لە ڕاستیدا شوێنی ڕاستەقینەی تەولیب دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی تورکیا واتە کوردستانی باشور و دەشتاییەکانی ئاسیا، عوسمانییەکان گواستیانەوە بۆ ئەستەمبوڵی پایتەختی ئیمپراتۆریاکەیان، کۆشکی سوڵتانەکان و باخچەکانیانی پێ دەڕازێندرایەوە، وشەی "تەولیب"یش لە وشەی "تولبنت"وە وەرگیراوە، کە ئاماژەیە بۆ کڵاوەکەی سوڵتان، کە لەم گوڵە دەچێت، شایەنی هێما بۆکردنە تەولیب بایەخێکی بازرگانیشی هەیە، بەزۆری لەپیشەسازی بۆن و دەرماندا بەکاردەهێنرێت. -وەرگێر-)

ناوەکـــانی وەك "ئـــەلبێرتی گـــەورە و ســـکووت ئیریجینـــاو تۆمـــا ئیکـــوینی" لـــە ئەســـتەمبوڵ، ئەگەرچـــی لـــە چوارچـــێوەیەکی بەرتەسکیشـــدا بـــوو، ناســـراوبوون[1]. ئیـــدی بیرۆکـــەی ئامـــادەکردنی پرۆژەکانی ڕیفۆرمی سەربازی کارێك بوو قبوڵ دەکرا، بۆ نموونە ئەو پرۆژەی کە ئەفسەرێکی فەرەنسی بە ناوی دو ڕوشفور De Rochefort لـە سـاڵی (١٧١٨ن) دا، بـۆ ڕیفـۆرمکردن لـە بـواری سـەربازی بـە ناونیشانی: "پرۆژەیەك لە پێناو پێکهێنانی گروپێکی ئەندازیاری بۆ ڕاژەکردنـی بابیعالی" پێشکەشـیکرد[2]. ئەگەرچـی هـەل و مەرجـەکان بواری جێبەجێکردنی پرۆژەکەیان نەدا، بەڵام ئیبراهیم دامادی وەزیر ویستی وابوو لە نزیکەوە سیماکانی پێشکەوتنی ئەورووپا ببینێت. هـەر بۆیـە لـە سـاڵی (١٧١٩ن)دا نێردراوێکـی بـەناوی موحەممـەد ئەفەنـدی نـارد بـۆ پـاریس و داوای لێکـرد، پـاش گەڕانـەوەی، لـە ڕاپۆرتێکـدا بـە وردی ئامـاژە بـۆ هـەر دام و دەزگایـەکی نـوێ یـا سـیمایەکی بیناسـازیی بکـات کـە شـیاون بـۆ ئـەوەی لـە وڵاتـی عوسمانیدا سوودیان لێوەربگیرێت[3].

نێـردراو دوای گەڕانـەوەی لـە سـاڵی دواتـردا، سـەبارەت بـە بینینەکانی لە پاریس کتێبێکی بەناوی "سەفارەتنامەی فەڕەنسا" تۆمـارکردوە[4]، بـەهۆی ئـەوەی لـە فـۆرمی کتێبێکـی گەشـتنامەدا بابەتەکـەی داڕشـتۆتەوە، هـەر لـە دەرچـونیەوە لـە ئەسـتەمبوڵ تـا

---

1 -Adnan, A: La science chez les turcs.P.127

2 Berkes. N: the development of secularism in Turky. Montreal. McGill Univ press. 1964. P.31

٣ هەمان سەرچاوە، ل٤٠.

٤ لە پیشاندانی ئەم بابەتەدا پشتمان بەم وەرگێڕانە فەڕەنسیە کەوتووە:

- Relation de L"ambassade de Mehemed Efendi á la cour de France en 1720 á paris chez Ganeau 1757.

گەیشتنی بۆ پاریس و مانەوەی تیایداو سەرلەنوێ گەڕانەوەی بۆ دەرگای بەختەوەری، لە درێژدادڕی بەدورنییە.

هەروەها لە کتێبەکەیدا پێش گەیشتنی بۆ پاریس وەسفێکی شارەکانی فەڕەنسای کردوە: تۆلۆزی زۆر گەورەو ناسراو، بۆردۆی پڕ لەدانیشتوان کە لە نێو شارەکاندا وێنەی نییە، بواتیێ بە قەڵا وێرانەکەیەوە، ئۆرلیان کە جوانترین شوێنەکانی فەڕەنسایە.

هەروەها موحەممەد ئەفەندی سەفیر سەرنجی نەریت و پەیوەندییەکانی نێوان ژن و پیاوی داوە: "لە فەڕەنسادا پیاوان ڕێزێکی زۆر لە ژنان دەگرن... بەجۆرێك ژنان چییان بوێت دەیکەن... لە هەموو جێگەیەك ڕێز بۆ فەرمانەکانیان دادەنرێت، وتراوە کە فەڕەنسا بەهەشتی ئەوانە، چونکە بێ هیچ ماندوبوونێك دەژێن، ئەگەر ئارەزووی هەرچیش بکەن، بە ئاسانی بەدەستی دێنن".

لە پاریسدا نمایشیی سەربازیی و تیپە ڕێکخراوەکان سەرنجی ڕادەکێشێت "پێویستە ئەوە بڵێم کە تیپگەلێکی زۆر جوان و زۆر ڕەونەقدار و زۆر بەهێزم بینیوە".

لە نێوان ئەو مەسەلانەی لە وەسفکردنیدا قووڵبۆتەوە کۆشکەکانی پاشایەتییە، وەك ڤێرسای ومارلی و سان کلۆ و ئەوانیتر، لە ڕاپۆرتەکەیدا وەسفێکی سەردانەکانی کردووە بۆ هەندێ لە مانیفکتۆرەکان، لەوانە مانیفکتۆرەیەك بۆ دروستکردنی قوماش، کە (٥٥٠) کریکار کاریان تیاکردووە، یەکێکیتر بۆ دروستکردنی شوشە (١٠٠٠) کرێکار کاریان تیاکردووە. هەروەها باس لە سەردانی ئەو بنکە فەلەکەوانیە دەکات کە لویسی چواردە فەرمانی دامەزراندنی دەرکردوەو ئەستێرەناسێکی ئیتالی بەناوی کاسینی Cassini سەرپەرشتیکردووە، موحەممەد ئەفەندی دەڵێت: " بورجێکی گەورەی لە بەرد دروستکراو هەیە بەبەرزی سێ نهۆم، لە هەر

یەکێکیاندا ژمارەیەك زۆری پڕ لە ئامێر هەیە، کە لە ژمارە نایەن، یەکێکیان تایبەتە بە گەردوون و دەستنیشانکردنی ئەستێرەکان و هەندێکی تریان بۆ ئاسانکردنی کارەکان و ناسینی مانگی نوێ و بەرزکردنەوەی ئاو لە خوارەوە بۆ سەرەوە هەندێ شتی سەیرو سەمەرەی تر، هەروەها زۆر کەرەستەی ئەندازیاریم بینی... هەروەها ئامێرێکی تازە داهێنراوم بینی بۆ ئاگاداربوون لە خۆرو مانگ گیران... هەروەها سەفیر لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: "کاسینی ئەو ئەستێرەناسە مەزنە پێش ئەوەی دۆزینەوەکانی تەواوبکات مرد، بەڵام لە پیشەکەیدا کوڕەکەی شوێنی گرتۆتەوە.. ئەو مەسەلانەشی پیشاندام کە باوکی لە بارەی ڕەخنەگرتن لە تابلۆکانی بەتلیمۆس ئامادەیکردبووو. لە ڕاستیشدا ئەم تابلۆیانە لە کتێبخانەکەی سوڵتاندا تا ساڵی (١٧٧١ز) بێ وەرگێڕان مایەوە، لەو ساڵەدا وەرگێردرا بۆ زمانی تورکی.

لە ناو ئەو شوێنانەی ناوبراو سەردانیکردوون، کەنیسەی نۆتردامە کە لە ناوەڕاستی پاریسدا بووە، هەروەها ئۆپێرایە کە دیمەنە جوانەکانی تێدا نمایشدەکرا و ژمارەیەکی زۆری خەڵك بە بەردەوامی بۆ بینینی دەهاتن.

موحەممەد ئەفەندی بە گشتی سەرنجەکانی خۆی لەسەر پاریس خستۆتەڕوو، کە پێیوایە لە دوای ئەستەمبوڵ بێ وێنەیە، هەردوو شاریشی بەراوردکردووە و ئەوەی تێبینیکردووە کە: "بەهیچ جۆرێك ئەوە ڕاست نییە گوایە پاریس لە ئەستەمبوڵ گەورەترە... تەنها ئەوەیە لە دەشت و دەردا ژمارەیەکی زۆرتری خەڵك دەبینرێت، چونکە ئافرەتان بەهیچ چەشنێك لە ماڵدا خۆیان ناگرن.. ئەم تێکەڵبوونەی پیاو و ژن لە شارەکەدا پڕ دانیشتوانتر پیشانیدەدات کە لە واقیعدا وانیە".

گەشتەکەی موحەممەد ئەفەندی بۆ پاریس لە گەیاندنی دیمەنی پێشکەوتنەکانی ئەورووپا بۆ ئەستەمبوڵ ڕۆڵی گەورەی گێڕا. گرنگیدانی موحەممەد ئەفەندی و چینی حوکمڕانی عوسمانیش کە بەقسەیان دەکرد، ئاڕاستەی دوو مەسەلە کران: ڕێکخستنی سەربازی و پەرەسەندنی چەك و تفاقی جەنگی لە لایەك و پێشکەوتنی بیناسازی لە لایەکی تر. لە حەقیقەتدا ڕاپۆرتەکەی ناوبراو دیمەنێکی وردی لەسەر بیناسازی لە پاریسدا بە گشتی پیشانداوە، بەتایبەت ئەوەندەی پەیوەندی بە بیناکردنی کۆشکەوە هەیە ئەوا چالاکیی سوڵتان و وەزیرەکەی بۆ لاسایکردنەوەی بیناکردنی کۆشکە فەڕەنسیەکان لە دەرەوەی ئەستەمبوڵ و ئارەزووو بۆ ژیانی خۆشگوزەرانی و بەرخۆری دەستیپێکرد، ئەوەبو لە ساڵی (١٧٣٠ن)دا کۆتایی سەردەمەکەی لەگەڵ خۆی هێنا، پاش ڕاپەڕینێکی نارەزایی کە چینی گشتی لە پایتەختدا ئەنجامیاندا.

## تێگەیشتن لە تەکنیك

یەکێك لە ئاکامەکانی گەشتەکەی موحەممەد ئەفەندی بۆ پاریس هێنانی چاپخانە بوو بۆ ئەستەمبوڵ، کە بوو بە یەکەم چاپخانەی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا. کردنەوەی چاپخانەکە مەسەلەیەکی ئاسان نەبوو، زنجیرەیەك ئامادەکاری دەویست، بۆ قایلکردنی بەرپرسان، لەوانە "شەیخولئیسلام" و پیاوانی ئاینی، دەربارەی سوودەکانی دانانی چاپخانە لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، ئەوەبوو ئیبراهیم موتەفەڕیقە لە ساڵی (١٧٢٦ن)دا سەبارەت بە گرنگی هێنانی ئەم هونەرە بۆ وڵاتی عوسمانی لەژێر ناونیشانی "کەرەستەی چاپەمەنی" نامەیەکی بۆ سەدرولئەعزەم و شەیخولئیسلام بەرزکردەوە، تا شەیخولئیسلام ڕەزامەندی پیشان

نەدا، فەرمان بۆ کردنەوەی چاپخانەکە دەرنەچوو، مەرجیشی ئەوەبو، نابێت کتێبە ئاینییەکان بە هەمو لقەکانیەوە پێ چاپبکرێت، بۆ سانسۆرکردنی بلاوکراوەکانی چاپخانەکەش دوو کەس دانران. ئەو کەسەش بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی چاپخانەکە دانرا، ئیبراهیم موتەفەڕیقە خۆی بوو، کە کەسایەتیەکی لێهاتوو فرە بەهرەبو، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە بەتایبەت لە بواری بانگهێشتکردندا بۆ نوێبوونەوە و کرانەوە بەڕووی ڕۆژئاوادا[1].

ئیبراهیم موتەفەڕیقە لە کلوژ (Cluj) کە ناوچەیەکە لە ترانسلڤانیا لە دایکبووە، ناوی ڕاستەقینەی خۆی و خێزانەکەی نادیارە، بەڵام پێدەچێت ساڵی لەدایکبوونی بکەوێتە نێوان ساڵانی (١٦٧٠-١٦٧٤ز). هەرچی ساڵە بەراییەکانی هەرزەکارییەتی، پێدەچێت بەم جۆرەبێت: لە یەکێك لە شەڕەکاندا بە دیلی کەوتۆتە دەست سوپای عوسمانی و وەك کۆیلەیەك فرۆشراوە، بە تەواوی و وردی نەزانراوە کەی موسڵمان بووە یان بەچی چەشنێك ڕۆشبیرییە ئیسلامییە بەراییەکانی وەرگرتووە بەلام لە کاتێك لە کاتەکاندا لە حکومەتی عوسمانیدا ڕاژەی کردووە و دواتر قۆناغ دوای قۆناغ گەیشتۆتە پلەی موتەفەڕیقە. پێدەچێت ئیبراهیم لە خێزانێکی هەنگاری سەر بە ئاینزای یەکتاپەرستی ( Unitarianisme ) بوو بێت، کە لە زێدی خۆیدا بەربلاوبوو[2].

---

[1] بۆ زانیاری تێر و تەسەل لەسەر چاپخانە بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

Brekes. N: The Development of secularism ....

Lewis. B.the emergence of modern Turkey.

Toderini: de la literature des turkey.

[2] Berkes. N: art, Ibrahim Muteferqa Ei2 Vol. 3.P1021

یەکەمین نووسینەکانی ئیبراهیم (نامە ئیسلامیەکان) بوو، کە تیایدا باس لە گواستنەوەی خۆی دەکات لە ئایینی مەسیحییەوە بۆ سەر ئایینی ئیسلام، لە چوارچێوەی باسەکەیدا ڕەخنەی خۆی ئاڕاستەی کاتۆلیك و پاپا کردووە، هەروەها بڕواکانی بە سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر کاتۆلیکیدا لە ئەوروپا پیشانداوە. ئەم نامەیە کە پێدەچێت لە ساڵی (١٧١٠ز)دا نوسرابێت، هیچ بیرۆکەیەکی تایبەتی سەبارەت بە ڕیفۆرمکردنی دام و دەزگاکانی عوسمانی تیا نییە[1].

ئیبراهیم دوای نووسینی ئەم نامە بەچەند ساڵێك ئەرك و بەرپرسیارێتیە کارگێڕییەکانی دەستپێکرد، چەندین ئەرکی دیپلۆماتی پێسپێردراوە، لەوانە لە ساڵی (١٧١٦ز)دا بۆ گفتوگۆو سازش لەگەڵ میر ئۆجین ڕەوانەی نەمسا کراوە، هەروەها لە ساڵی (١٧٢٠ز) دا نێردراوە بۆ بەلگراد، لە ساڵی (١٧٣٧ز)دا بۆ کییف و لە ساڵی (١٧٤٣ز)یشدا بۆ داغستان[2].

بەڵام ناوونابانگی ئیبراهیم موتەفەڕیقە ناگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵە دیپلۆماتکارانەکەی، ئەوەندەی پەیوەندی بە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی یەکەم چاپخانەوە هەیە لە جیهانی ئیسلامیدا، کە وەك بڵاوکەرەوەو پۆلێنکارو وەرگێڕو نووسەر کاری تیاکردووە. شایەنی وتنە شارەزایی لە چەند زمانێکی ئەوروپیدا لەوانە فەڕەنسیی و ئیتالی و هەنگاری، یارمەتیدەری بوون بۆ بینینی ئەو هەمو ڕۆڵە.

کاری چاپخانەکە لە دامەزراندنیەوە لە ساڵی (١٧٢٨ز)دا تا مردنی ئیبراهیم موتەفەڕیقە لە ساڵی (١٧٤٥ز) بەردەوام بوو، لەو ماوەدا چەندین کتێبی زانستی و زمانەوانی و مێژوویی بڵاوکردەوە لەوانە: کتێبێکی زمانەکان، فەرهەنگێکی عەرەبی-تورکی بوو، لە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٠٢٢

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٠٢٢

دوو بەش و (١٤٢٢) لاپەڕە پێکهاتبوو، لە ساڵی (١٧٢٨ن)دا، ناوازەی گەورەکان، کە تایبەت بوو بە جەنگە دەریاییەکان، لەگەڵ نەخشەکانی حاجی خەلیفەدا، لە ساڵی (١٧٢٨ن)دا. مێژووی داگیرکاریی ئاغاخانەکان کە لە زمانی لاتینییەوە کرابووە تورکی، لە ساڵی (١٧٢٩ن)دا. کتێبی مێژووی دورگەکانی هیندی ڕۆژئاوا یان ئەمەریکا، پێکهاتبوو لە (٩١) لاپەڕە، لە ساڵی (١٧٣١ن)دا. سوودەکانی قیبلەنما لە ٢٣ لاپەڕە پێکهاتبوو، لە ساڵی (١٧٣١ن)دا. کتێبی ئاوێنەکانی جیهان لە نووسینی حاجی خەلیفە (٦٩٨) لاپەڕە بوو، لە ساڵی (١٧٣٢ن)دا. مێژووی ڕەشید ئەفەندی لە ساڵی (١٧٤٠ن)دا. فەرهەنگی تورکی فارسی، لە ساڵی (١٧٤٢ن)دا[1].

ئەمە گرنگترین کتێبە چاپکراوەکان بوو لە یەکەم چاپخانەی ئەستەمبوڵدا، کە دەتوانین بە گوێرەی بابەتەکانیان بۆ سێ بەش پۆلێنیان بکەین: کتێبە مێژووییەکان کە لە ڕووی ژمارەوە بە پلەی یەکەم دێن، پاشان کتێبە جوگرافییە زانستیەکان، کە پەیوەندیان بە هونەری سەربازیەوە هەبوو، ئینجا فەرهەنگە زمانەوانیەکان لەوانەش بەشێوەیەکی تایبەت فەرهەنگی تورکی-فەڕەنسی کە بڵاوکردنەوەی ئارەزووی ڕاستەقینەی بۆ کرانەوە بەڕووی ئەورووپا و زانستە نوێکاندا پیشاندەدا.

لە دیارترین کتێبەکانی چاپخانەکە کتێبێك بو پێکهاتبوو لە (٩٦) لاپەڕە کە لە نووسینی خودی ئیبراهیم موتەفەڕیقە بوو، کتێبەکە بەم ناوەوە بوو "بنەماکانی حوکمڕانی لە سیستێمی گەلاندا" کە لە ساڵی (١٧٣١ن)دا بڵاویکردۆتەوە[2]، دەتوانین ئەم

---

[1] ناوی سەرجەم کتێب و ڕاڤەکردنەکانی لەم سەرچاوەدا هەنە:

T0derini: de la litterature des turcs tome 3.

[2] پشت بەم وەرگێرانە فەڕەنسییە بەستراوە:

کتێبە بە یەکەم هەوڵی تیۆریی دابنێین کە لەم بوارەدا نوسراوە، تیایدا نووسەر داوادەکات سوود لە زانست و تەکنیکە نوێکانی ئەورووپا وەربگیرێت، هەروەها داوای ئەوەدەکات سوپای عوسمانی بە گوێرەی شێوازە تازەکان ڕێکبخرێتەوە.

نووسەر کتێبەکەی بۆ چوار بەش دابەشکردووە، کە بریتین لە: بەشی یەکەم باس لە پێویستی نەزم و دیسپلین و سوودەکانی دەکات، بەشی دووەم بە کورتی باس لە سوودەکانی لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی دەکات، بەشی سێیەمیش باس لە فۆرم و شێوازەکانی سوپای مەسیحی و ڕێساکانی سیستمی چاودێرییان دەکات و هەروەها سیستێمی سەربازیی تۆمارکراوو جێبەجێکراو لە جەنگەکانیاندا دەخاتەڕو.

سەرەتا باس لە ڕەوشی دانانی کتێبەکەی دەکات، پێدەچێت نووسەر وەك لە پێشەکیەکەیدا ئاماژەی پێداوە "بنەماکانی حوکمڕانی" لە قۆناغی خۆدابڕینێکی کاتیدا نوسیبێت. زیاتریش پێدەچێت دانانی هاوکات بێت لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینەی کۆتایی بە حوکمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم هێنا و مەحمودی یەکەمی هێنایە سەر تەخت. دەڵێت: " بەوجۆرە چومە خەڵوەتەوە و لە تاریکی تەنیایدا خۆمم دایەدەست بیروخەیاڵەوە و تامی ئاسوودەیی دەروون و بەهەشتی ژیانی تایبەتم کرد. تا دەرکەوتنی خۆری سوڵتانی بنەماڵەی عوسمانی لە ساڵی (١١٤٣ك/ ١٧٣٠ز)دا، ئیدی زەینی خۆمم بینییەوە ڕۆشناو پڕ لە بیرو ئاوەز، چەشنی دڵی پڕ لە ژان بەهۆی بینینی ئەو تاوانانەوە بەدرێژی ئەو ساڵە و بەهۆی ئەو کارەساتانەی لە پڕێکدا یەخەی دەوڵەتی عوسمانیان گرت".

Traite de La tactaque. A Vienne 1769

ئەو سوڵتانەی کە نووسەر هێمای بۆکردووە سوڵتان مەحمودی یەکەم (١٧٣٠-١٧٥٤) بوو، کە دوای ڕاپەڕینێك بەڕێبەرایەتی ئینکیشاریەکان، کە تیایدا سوڵتان ئەحمەدی سێیەم و وەزیرەکەی ئیبراهیم داماد کوژران، هاتە سەر عەرش[1].

ئەگەر ئەوە ئەو دۆخە بێت کتێبەکەی تیا نووسیوە، ئەوا هۆکارەکانی نووسینەکەی بەم شێوە باس دەکات: "لەو ماوەدا بیرم چوو بۆ هۆکارەکانی ئەم شۆڕشە و کەوتمە لێکۆڵینەوە لە بناغەی خراپیەکان.. بەهەڵەدا نەچووم گەر ئەم ئاکامانە لە خراپ بەکارهێنانی دام و دەزگاکانی دەوڵەت و کەمتەرخەمی وەزیرو گەورە بەرپرسان و ڕانەپەڕاندنی ئەرك و بەرپرسیارێتیەکانیاندا کورتبکەمەوە.. جێی خۆیەتی بگەینە ئەو بڕوایەی کە نیشانەکانی بێهێزیی لە جەستەی دەوڵەتدا و سیماکانی لاوازی لە هێماکانی داتەپین و هەڵوەشانەوە زیاتر هیچی تر نین".

بێگومان ئیبراهیم موتەفەڕیقە لە کتێبەکەیدا بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی داتەپینی دەوڵەتەکەیان هەمان ڕێبازی بیرمەندە عوسمانییەکان دەگرێتەبەر، بەڵام شتێکی نوێ زیاددەکات، کە لای ئەوانەی پێش خۆی دیار نەبوو، دەڵێت:" بەهێزترین پاڵنەرم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە کە لە توانای و سنووری عەقڵی مندا نەبوو ئەوەیە، ئەگەر ئەم گەلە مەسیحییە قێزەونە (مەبەست ئەورووپیەکانە)، لە ڕووی ژمارەو سروشتی جەستە و عەقڵەوە بەراورد بە موسڵمانەکان خاوەن ڕەگەزێکی کەساس بن، بەڵام ئەوەتانێ چەند ساڵێکە بە تەواوی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، تەنها چەند

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٣٧.

هەرێمێکیشیان کۆنترۆڵ نەکردووە بەڵکوو چەندین جار بەسەر عوسمانییەکاندا سەرکەوتوون ".

دەرکەوتنی میکانیزمی ئەورووپی لای ئیبراهیم موتەفەڕیقە خاڵێکی نوێ بوو بۆ ئەوەی هۆکارەکانی داتەپینی عوسمانیی پێ ڕاڤەبکات. لەم سۆنگەوە ڕێبازی چارەسەرکردنی قەیرانەکەی بە جۆرێکی تر داڕشتەوە. ئەم مەسەلەیە لە بەشەکانی کتێبەکەدا هەروەها لە میانەی سەرچاوە و بابەتەکانیدا کە نووسەر بۆ نووسینی کتێبەکەو تەواوکردنی کارەکەی بەکاریهێناون، هەستپێدەکەین، دەڵێت: " زمانی لاتینی کە لای من نامۆ نییە، لەم هەوڵەدا زۆر یارمەتیدام، چونکە لە میانەی ئەو زمانەوە توانیم زانیاری ناو ئەو کتێبانە کۆبکەمەوە کە مێژووی ئەو گەلانەی لەخۆگرتووە، هەروەها بگەڕێمەوە سەر ئەو کتێبانەی دەربارەی هونەری جەنگن، هەروەها گەڕامەوە سەر ژمارەیەك نامەی پەیوەندداربە تەکتیك و دامەزراوە سەربازییەکان و فۆرمی نەزم وديسپلينيان لە شەڕەکاندا.. هەر لە میانەی زمانی لاتینییەوە توانیم بە ئەزمونی تێکڕای گەلان ئاشنابم.. ".

موتەفەڕیقە کتێبەکەی بەوە دەستپێدەکات، کە دەسەڵات بۆ کۆمەڵگاکان پێویستن "گرنگی بوونی فەرمانڕەوا لەناو خەڵکاندا" دەڵێت: " دەبوو ئادەمیزاد بۆ فریادڕەسێکی هاوبەش بگەڕێت، لێرەوە ئارەزووی بۆ کۆبوونەوە و هاریکاری پەیدابوو، بەهۆی بێتواناییان لە خۆبەڕێوەبردندا تاوێك پەیامبەرو تاوێك موژدەبەریان بۆ ڕەوانەدەکرا تا ئەو یاسانەیان بۆ دابنێت کە لە شارەزابوونیانەوە بۆ جێبەجێکردنی دادوەری سەرچاوەی گرتبوو". هەروەها دەڵێت: " بەگوێرەی ئەم ڕێکخستنە دەبینین گەلان لە فۆرمی عەشیرەت و نەتەوەکاندا بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە. هەر گروپێکیان سەرۆکێکی

هەڵدەبژارد، ئیدی لەوێوە دەوڵەتە زۆر و زەوەندەکان لەسەر زەوی پێکهێنران و خەلیفەو ئیمپراتۆر و سوڵتان و سیزارەکانیش دەرکەوتن..."

نووسەر مەبەستی بوو لە باسکردنی ئەم مەسەلەدا هێما بۆ جیاوازییەکانی فۆرمی حوکمڕانی لە جیهاندا بکات. بەڵام کاتێك دێتە سەر باسی فۆرمەکانی دەسەڵات، ئەوا لە سێ جۆردا کورتیدەکاتەوە. بەگوێرەی بۆچوونی سێ لە دیارترین فەیلەسوفە دێرینەکان: فۆرمی ئەفلاتۆنی کە بۆچوونی وایە پێویستە پاشایەکی دادپەروەر و ژیر دەوڵەت بەڕێوەببات. ئەم جۆرە لە دەوڵەت لە زمانە لاتینیەکاندا یان یۆنانیدا پێیدەوترێت "مونارشی" یان پاشایەتی و زۆربەی وڵاتانی جیهان بەم ڕێبازە بەڕێوەدەبرێن. فۆرمی ئەرستۆیی بە گوێرەی ئەم فۆرمە پێویستە دەسەڵات بدرێتە دەست گەورە پیاوانی دەوڵەت، بەزمانی فەیلەسوفەکان بەم جۆرە دەوترێت (ئۆرستۆکراتی)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کۆماری بووندوقییە ئەم فۆرمە لە دەسەڵات پەیڕەودەکات. لە کۆتایشدا فۆرمی دیموکراسی دێت، لەم فۆرمەدا دەسەڵات لای گەلە بۆ ئەوەی زوڵم و ستەم بسڕێتەوە، ئەم جۆرە لە دەسەڵات لە ئەمڕۆدا لە هۆڵەنداو ئینگلتەرا پیادەو جێبەجێدەکرێت.

وەك بڵێی خولیای سەربازیی تاکە بابەتە هەوڵ و تەقەللای بۆ دەدات، لە سەرجەم لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا جەخت لەم بوارە و ئەو لقانەی پابەندن یان لقێکن لەم بوارە، دەکاتەوە. لەژێر ناونیشانی: ئاشکراکردنی پێداویستی دەوڵەتان لە ئاشکراکردنی ئەحکامەکانی دەوڵەتەکەیاندا و مانەوەی نەزم و دیسپلینی دۆخیان تا ڕێکخستنی لەشکرەکەیان، دەڵێت: "سوپایەك پابەندبێت بە ڕاژەکردنی میرو دەوڵەتەوە ئامادەی فەرمان بێت و بەئامرازی باش و هونەری جەنگ

تـەیارکرابێت، سـەرجەم چـەکەکانی بـەرگریکردن و هێرشـبردنی بـۆ دابینکرابێـت، ئەمـە ئـامرازی سـەرەکی بـەهێزیی دەوڵـەت و هـەموو پێشکەوتنێك و پاراستنی وڵاتەکەشە.

هەروەها دەڵێت:" موسڵمانەکانیش هێـزی خۆیـان هـەبوو، لەگەڵ دەرکـەوتنی بنەماڵـەی عوسمانیـدا بازوویـان پتـەوبوو، ڕۆحـی سەربازیشیان بەرزبووەوە و تێکڕای زەویان داپۆشی.. بەڵام لـە دوای پاشەکشـێیکردنی زیرەکییـان، ئـەم هێـزە بـە شـێوەیەکی بەرچـاو لاوازبوو. ئـەرکی تێکڕای ڕەعیەتـە گـەورە و خەڵکـە عەوامەکەیشـە لـە هۆکارەکانی ئەم گۆڕانە خراپە بکۆڵنـەوە و بنچینەکانی ئەم لاوازییـە دەستنیشانبکەن و بچنە سەر ئەم مەسـەلە گرنگە.... بۆ دۆزینـەوەی ڕێگەچارە بـۆ ئـەم بابەتـە ئـاڵۆزە پێویسـتە بـەوردی شـێوازی نـوێی جـەنگیی دوژمـن دەستنیشـانبکرێت و بـەقوڵی لێکۆڵینـەوەی لەسەربکرێت، ئەوکات بنەمای هەڵەکە و سەرچاوەی ناتەواوییەکان لـە بنکـە سـەربازیەکانماندا بـۆ هـەمووان ئاشـکرادەبێت... پێویسـتە شـارەزایی لـە پرنسـیپ و ڕێسـا تـازە داهێنراوەکـان پەیـدا بکـەین و پەرەیانپێبـدەین، ئەوانـەی لـە لایـەن سـوپای پاشـاکان و نەتـەوە مەسـیحییەکانەوە بـەکاردەهێنرێن و پلـە بـە پلـەو بەئاگاییـەوە پەرەیانپێدراوە و بەدۆزینـەوەی ئـامرازو چەکی نـوێی تـەواو جیـاواز لـەوەی لـە کۆنـدا هـەبوو سـازو ئامـادەکراوە، لـەم ڕووەوە پێویسـتە مەشق بە خەڵکی ژێر بکەین".

یـەکێك لـەو زانسـتانەی کـە بایـەخێکی تایبـەتی پێداوە زانسـتی جوگرافیایـە، بـەگوێرەی موتەفەڕیقـە بـەبێ شـارەزایی لـە جوگرافیـا جەنگەکان نابرێنەوە، دەڵێت: "لـە هەقیقەتدا جوگرافیا ئاوێنەیـەکی ڕوونە، تیایدا بە یەك نیگاو بەڕوونی هەموو گەل و نەتـەوەکانی گـۆی زەوی دەبینین.. گەلانی ئیمانداری یەکتاپەرست، و پـەرش و بڵاو بە

شوێنە جیاوازەکاندا، لە میانی ئەم ئامرازەوە (جوگرافیا) ئاگاداری یـــەك دەبـــن و ســـەرلەنوێ خۆیـــان کۆدەکەنـــەوەو تواناکانیـــان یەکدەخەنـــەوەو بـــۆ بەگژاچـــونەوەی زوڵـــم و ســـتەمی بێبڕواکـــان (ئەوروپییەکان) یەکێتیەك پێکدێنن.".

لـە گـەورەترین بەشـی کتێبەکەیـدا موتەفەریقە بەدرێژی باس لـە فۆرمەکانی ڕێکخستنی سوپای مەسیحی لە شەڕەکان و جۆری چەکە بـەکارهاتووەکان و جـۆری سەنگەرسـازی و سەرچـاوەکانی بڕیـارو فەرمان دەکات.. هتد، تا دەگاتـە کۆتایی کتێبەکـەی لەویادا ڕووسیا دەکاتـە نموونـە، کـە چـۆن چـەند سـاڵێك لەوەوبـەر لـە شـەڕێکی یەکلایکـەرەوەدا بەسـەر عوسمانییەکانـدا سـەرکەوتون، تێبینـی ئـەوەش دەکـەین نووسـەر بابەتیانـە ئـەزمونی "مۆسـکۆڤ" یـان ڕووسـەکانی هەڵسـەنگاندووە، دەڵێـت: " بەسـوودە تێبینـی ئـەوە بکەین، مۆسکۆڤ پێشتر لە گەلێکی کەساس زیاتر هیچی تر نەبوون.. توانـای بەگژاچـونەوەیان لەگـەڵ هـیچ سـوپایەکدا نـەبو.. بۆیـە پاشەکشـێیان کـرد بـۆ شـوێنێکی دووری گۆشـەیەکی زەوی لـە ئاووهەوایـەکی سەهۆڵبەنداندا... لـەم هـەل و مەرجـەدا بـوون کاتێك قەیسـەرێکی بـەهرەدار و شـارەزا لـە کاروبارەکـانی حـوکمڕانی و دەوڵەتانی تر لە نێویانـدا هەڵکەوت، ئەوەبوو لـە فۆرمی سیستێمی سـەربازی و پرنسـیپی حکومەتـەکانیان و بـەڕێوەبردنی کاروبـارە مـەدەنی و سیاسـییەکانی کۆڵیـەوە، دوای ئـەوەی سـوپای پیـادەی لەسەر شێوازی دەوڵەتە ئەوروپیـەکان ڕێکخسـت.. بینیـی هـیچ لایـەك دەستی بەسەر دەریاچەی قەزویندا نەگرتووە، پلانـی دانـا بـۆ دەسـت بەسـەراگرتنی و لـە بەندەرەکانیـدا کەشـتی و پـاپۆڕی بوونیادنـا، بـە بڕوبیـانووی ئـەوەی گوایـە بازرگـانی لەگـەڵ وڵاتـی فارسـدا دەکـات، ئەنـدازیاری لـە وڵاتـانی جیاجیـاوە بانگهێشتکرد، نەخشـەی وردیـان

لەسەر ولاٌتە دراوسێکان بۆ دانا، بۆ ئەوەی لە جەنگەکانیدا دژ بە فارس و داغستان و هەرێمە دراوسێکانی ڕێنمایی بکەن".

ئیبراهیم موتەفەڕیقە لە چوارچێوەی باسکردنیدا بۆ یاساکانی ئەورووپا سەرنجی ئەوەی داوە: "گەلانی مەسیحی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا یاسای پیرۆزیان نییە، کە پەیوەندی بە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی حکومەتەوە هەبێت، واتە یاسایەکی خوداییان نیە لە ڕووی ئایینیەوە پێوەی پەیوەستبن، چی لە کاروبارەکانی یاسادانان و چی لە بڕیارە ئاڵۆزەکاندا بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت، ئەوان تەنیا بە یاسا مرۆییەکانەوە پابەندن کە دەرهاوێشتەی ڕۆشنایی عەقڵە بە تەنیا"[1].

ئیبراهیم موتەفەڕیقە یەکەم موسڵمانە لە فیکری ئەورووپی بە ئاگابێت و فیکری ئەورووپی ئەزموونکردبێت و کاریگەربووبێت پێی. بە بەردەوامی سەرسامی خۆی سەبارەت بە جەسارەت و چالاکیی ئەورووپییەکان پیشانداوە: "ئەم گەلە هەمیشە سوودمەندانە لە تەمبەڵیی موسڵمانەکان و گرنگینەدانیان بە ناسینی دوژمنەکانیان، زیاتر و زیاتر لە سنوورەکانمان نزیکدەبنەوە".

دەوڵەمەندبوونی کتێبەکەی موتەفەڕیقە لەڕووی فیکرییەوە، ئەوەی تێپەڕاندووە بە تەنها نمایشکردنێك بێت بۆ زانستەکانی ئەورووپا و پێشکەوتنەکانی، بەڵکو هەوڵێکە بۆ دورکەوتنەوە لە شێوازە سونەتیە باوەکانی بیرکردنەوەی عوسمانیی و نزیکبوونەوە لە بیرکردنەوەی ئەورووپی لەمەڕ مەسەلەکانی دەوڵەت و حوکمڕانی و زانستەکان. هەوڵیداوە جیاوازی لە نێوان گەنینی ئاینی ئەورووپیەکان و لە نێوان باشی و شایستەیی ئەو زانستانەی لەوانەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

دێـن و بەرهـەمی ئەزموونـە نوێیەکانیانـە، بکـات، لـەوەش زیـاتر بەگوێرەی ئیبراهیم موتەفەڕیقە (بێپڕوایـی) ئەوروپیەکان بەربەرست نـەبووە لـە بەردەمیانـدا بـۆ گەیشـتن بـە پلەیـەکی بـاڵاتری هێـزو پێشکەوتن.

دەتـوانین بڵـێین کتێبـی "بنـەماکانی حـوکمڕانی لـە سیسـتمی گەلاندا" یەکەم هەوڵی تیۆرییە لەم بوارەدا مەسەلەی سوودوەرگرتنی لـە زانسـتە سـەربازیی و کارگێڕیـەکانی ئـەوروپاو پێویسـتیی وەرگرتنی تەکنیکە تازە داهێنراوەکان ورووژاندبێت.

بەهۆی خواست و ئارەزووی بۆ بیناکردنی کۆشك و فیرۆدانی سامان، سەردەمی ئەحمەدی سێیەم بە جۆرێك لە راپەڕین تەواوبو[1]، لەراستیشدا پابەندبوونی ئەحمەدی سێیەم بە سیماکانی پێشکەوتنی ئەورووپاوە زۆر زیاتر بوو لە درککردنی بە مەغزاو بنچینەکانی ئەم پێشکەوتنە، جەودەتی مێژوونوس لەم ڕووەوە دەڵێت:" لەو ڕۆژگارەدا خواستی دەوڵەت بۆ چوونە سەر ڕێبازی مەدەنییەت و ئارەزووی بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی ڕێکخراو سەریهەڵدا، بەڵام ئەوان سەرەکانیان جێهێشت و کلکەکانیان گرت، بەڵکو بێئەوەی تەماشای بنچینە بکەن، دەستیاندایە ڕازاندنەوەی بیناکان. چونکە ئەو لە بری هەوڵ و کۆشش بۆ تاقیکردنەوەی بازاڕەکانی پیشەو هونەر کە لە ئەورووپادا بڵاوبووەوە بە گەمژەکان هەڵخەڵەتاو ڕێبازی بەدمەسرەفی بەرنەدا... ئاکام لە ڕۆژگاری سەدارەتی (سەدرولئەعزەم) ئیبراهیم پاشادا ڕێگاکانی مەدەنییەت کرانەوە، لە "دارلسەعادەدا" پیشەسازی چاپەمەنی دامەزراند، بەڵام گەورە بەرپرسان نوقمی گەمژەیی بوون تا خەڵك دوری لێگرتن، ئەوەبوو ئاژاوە مەزنەکە سەریهەڵدا... پیشەسازی چاپەمەنی نەبێت لە ئەستانەدا هیچ نەمایەوە[2].

سەرباری ئەوەی هێزە کۆنەپارێزەکان توانییان کۆتایی بە سەردەمی ئەحمەدی سێیەم بهێنن، بەڵام جێگرەکەی مەحمودی یەکەم (١٧٣٠-١٧٥٤) پرۆژەکانی ڕیفۆرمی نەوەستاند، لە دەستپێکی سەردەمەکەیدا لە بواری کرانەوە بەڕووی زانستەکانی ئەورووپادا بۆ یەکەم جار هەندێ پەرەسەندن ڕوویاندا.

**دام ودەزگای نوێ**

دو بوونڤـــال (١٦٧٥-١٧٤٧)ی فەڕەنســـیی پرۆژەیـــەکی بـــۆ دامەزرانـدنی قوتابخانەیـەکی ئەنـدازیاری پێشکەشـکرد، پرۆژەیـەکی تریش بۆ دروستکردنی بۆدییەکی نوێ بۆ تۆپ، هەردوو پرۆژەکـەش خرانە بواری جێبەجێکردنەوە، کۆنت دو بوونڤال دوای ئەوەی بو بـە موسڵمان ناوی ئەحمەد پاشای لێنرا، دواتریش بو بە یەکەم بەرپرس لەسـەر یەکـەم بـۆدی تـۆپی نـوێی عوسمـانیی، هـەروەها لـە هێنـانی بۆدییـــەکی تایبـــەت بـــە پزیشـــکیی لـــە ســـوپای عوسمانیـــدا بەشداریکردووە[1].

دو بوونڤـال، کـە پـێش سـەقامگیربوونی لـە ئەسـتەمبوڵ وەك ئەفسـەرێك لـە سـوپای فەڕەنسـی و لـە سـوپای نەمسـادا خزمـەتی پێشکەشـکردووە، ڕۆڵێکـی سیاسـی لـە نزیـك چینی حـوکمڕانی عوسمانیـدا گێـڕاوە، دەوڵـەتی عوسمـانی لـە پێویسـتی پێکهێنـانی هاوپەیمانێتیـــەکی تـــورکی- فەڕەنســـی ئاگادارکردۆتـــەوە، بـــۆ بەگژاچوونەوەی مەترسیی ڕووسـەکان کـە لەسـەر حیسابی زەوی و زاری عوسمانییەکان خاکی خۆیان بەرفراوان دەکرد. بڕواشـی وابوو بەبێ بشتبەستن بە هاوکاری ئەورووپا عوسمانییەکان ناتوانن لەگەڵ نوێگەریی ڕووسیدا ڕووبەڕووببنەوە، ئەم هاوکاریەش دەبوو لـە لایـەن فەڕەنساوە بێت، بە بۆچوونی ئەو دەبوو پەرەپێدانـەکان لـە دەوڵـەتی عوسمانیـدا بەتـەنها بـواری سـەربازی نەگرێتـەوە، بـەڵکو بوارەکـانی ئابووریش بگرێتەوە[2].

---

[1] جب و بوون المجتمع الاسلامي والغرب، دار المعارف بمصر. ١٩٧١، ج١ ص٥٧.
[2] تاريخ جودت، ت. عبدالقادر الدنا،مجلد ١، بيروت ١٣٠٨ هـ ص٧٥.

هەروەها دو بوونڤال چەندین ڕۆڵی تری گێڕاوە لەوانە کاریگەری ڕاستەوخۆیی لەسەر هەندێ لە کەسایەتییەکان لە چینی فەرمانڕەوای عوسمانی لە میانەی ڕۆشنبیرکردنیان بە مەسەلە سەربازی و سیاسییەکان. دەربارەی سوودەکانی تەکتیکی نوێی سەربازی لە گۆڕەپانی شەڕدا وانەی بەپیاوانی دەوڵەت دەوتەوە، لەو ڕێگەوە پێویستی تێگەیشتن لە نەریتە دیبلۆماتیەکانی ئەورووپای بۆ دوپاتدەکردنەوە. لەم بوارەدا ڕاپۆرتێکی لەژێر ناونیشانی "هەندێ دۆخی مێژووی دەوڵەتانی ئەورووپا"[1] نووسیوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٣٢ز).

ئەحمەد پاشا بوونڤال لە سەرەتای ساڵی (١٧٣٤ز) وە تا مردنی لە ساڵی (١٧٤٧ز) لە کارەکەی کە سەرپەرشتی بۆدی تۆپی دەکرد بەردەوام بوو، وێڕای دورخستنەوەی بۆ ماوەی ساڵێك (١٧٣٨-١٧٣٩) لە سەردەمی یەکن موحەممەد پاشای وەزیردا،[2] دوای خۆیشی سلێمان ئاغای کوڕی بە سەرپەرشتی لەگەڵ فەرەنسیەکی تردا بەناوی "لاتور" شوێنیان گرتەوە.

لەگەڵ ئەو دەستکەوتە سنووردارانەی کە بوونڤال بەدەستیهێنا، دەوڵەتی عوسمانی یەکەمین هەنگاوەکانی بەرەو نوێکردنەوەی دام ودەزگا سەربازییەکانی هاویشت، ئەمەش مانای شکاندنی بەربەستی گۆشەگیری و کرانەوەی دەگەیاند بەڕووی ئەویدیدا، لەو کاتەدا سیمای چینێکی نوێ لە ڕۆشنگەرانی عوسمانی، کە شارەزاییان لە زمانە ئەورووپیەکاندا هەبوو و خەونیان بە نوێکردنەوەی وڵاتەکەیانەوە دەبینی، گەڵاڵەدەبوو.

---

[1] B owen. H: art. Ahmed Pasha bonneval. Ei2 Vol 1, PP 300-301

Berkes, N: The Develpement of Secularism..pp.47-48

[2] هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

یەکێك لەو ڕۆشنگەرانەی کە بڕوایان بەکرانەوە هەبوو بەڕووی ئەورووپادا، ڕاغیب پاشای[1] وەزیر بوو، لە سەردەمی سوڵتان عوسمانی سێیەم (١٧٥٤-١٧٥٧) دا، کە کەسایەتی ئەو لەناو ئەستەمبوڵ دا سەرنجی میوان و شارەزایانی ئەورووپی ڕاکێشابو.

ڕاغیب پاشا کە فەرمانی وەرگێڕانی چەندین کتێبی لە زمانە ئەورووپییەکانەوە دەرکردبوو، لەوانە کتێبێکی ڤۆڵتێر سەبارەت بە فەلسەفەی نیوتن[2]، کتێبخانەیەکی گشتی و گەورەشی لە ئەستەمبوڵ دامەزراند، کە کتێبگەلێکی زۆری تێدابوو، لەوانە کتێبەکانی پزیشکی ئینگلیزی سیدنهامSidenham، کە بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدرابوون[3]، ڕاغیب پاشا بۆ خۆی نووسەری چەندین کتێب بوو، یەکێك لە کتێبەکانی بەزمانی عەرەبی نوسیبو، ناوبراو کەسایەتیەکی سەرنجڕاکێش و سروشتێکی توندی هەبوو، هەروەها کەسێکی بەهرەدار بوو، لە پاڵپشتکردنی کرانەوە بەڕووی ئەورووپادا کاریگەری ئەو دیاربوو.

هەوڵ وتەقەللاکانی ڕیفۆرم لە سەردەمی موستەفای سێیەم (١٧٥٧-١٧٧٣)دا کە سوڵتانێکی چالاك بوو و مەیلی بەلای زانستە گەردوونیەکاندا دەڕۆیشت، بەردەوامبوو، هەندێ نێردراوی بۆ پایتەختەکانی ئەورووپا هەنارد، لە نێو ئەوانەدا نێردراوەکەی ئەحمەد ڕەسمی بوو، بۆ لای فردریکی دووەم، و بەتایبەت بۆ پرسیارکردنی نهێنی سەرکەوتنە سیاسیەکانی سەردانیکردبوو، پاشای پروسیا لەم ڕووەوە وەڵامەکەی بەم جۆرە کورتکردبووەوە: بە لێکۆڵینەوە لە مێژوو و سوودوەرگرتن لە ئەزمونەکان و خاوەندارێتی بۆ سوپایەکی

---

[1] Lewis, B:The use by muslim of non — muslim sources P.187

[2] Bowen. H: art Ahmad Pasha, Bonneval. P. 301

[3] Grohamann, A:art Raghib pasha Eil suppl. PP. 194-195

بەهێزو ڕاهێنراو لە ڕۆژگاری ئاشتی و جەنگدا، پاراستنی پڕی خەزێنە[1].

موستەفای سێیەم ئەوەندەی ئاو لە شوێن بێڵی هاتبێت، کاری بەم ئامۆژگاریانە کردووە، بۆ ئەو مەبەستەش بارون دو توت Le Baron de Tott ی ئەفسەری فەڕەنسی بەکارهێنا، کە حکومەتی وڵاتەکەی بەئەرکێکی تایبەت ناردبوویان بۆ ئەستەمبوڵ، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە دۆخی سەربازی عوسمانی لە کاتی جەنگ لەگەڵ ڕووسیادا، دو توت کە ڕێبەرایەتی ژمارەیەك ئەفسەری فەڕەنسی دەکرد، هەڵسا بە دروستکردنی تەنێکی نوێ بۆ هێزەکانی تۆپخانەو سەرلەنوێ تۆپخانەو گەنجینەی تفاقی جەنگی ڕێکخستەوە، هاوکاری دامەزراندنی قوتابخانەی دەریاوانی کرد، دو توت خۆی یەکەم کەسیش بوو کە کانەکانی خەڵوزی لە تورکیادا دۆزییەوە[2].

لە یاداشتەکانیدا دوتوت باس لە ئەزمونی خۆی دەکات لە ئەستەمبوڵ دا و باس لەو ڕەوشە دەکات تیایدا قوتابخانەیەکی نوێ بۆ ئەندازیاری کراوەتەوە، کاتێك سوڵتان موستەفای سێیەم لە لایەنگرەکانی ڕیفۆرم بووەو نەیارەکانیشی دژایەتی دامەزراندنی هەر دام ودەزگایەکی نوێیان دەکرد، لەو میانەدا باس لەوەدەکات چۆن بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی ناوبراو تەنها ئەمیان هەڵبژاردوە[3].

---

1 Berkes. N: The Development of secularism P.50

2 Todeini: de la literature des tures, T 2. 109

3 Kral, E. Z: La transfarmaion de la turquie d"un empire Oriental en un etat moderne. J. W. H. (1958). P. 430

هەروەها دوتوت باس لە دۆخی زانستەکانی ئەو ڕۆژگارە دەکات لە ئەستەمبوڵ و باس لە ئارەزووی قوتابیەکانی دەکات، کە بۆ زانینی زانستە نوێیەکان پیشانیانداوە دەڵێت: "خاکیانە داوام لە فەرماندە کرد پێم بڵێت کۆی گۆشەکان لە سێگۆشەدا چەندە؟ زیرەکترینی قوتابییەکان بەسەرامەتەوە پێی وتم: ئەوە پەیوەندی بە سێگۆشەکەوە هەیە... بەڵام پێویستە ڕاستگۆبم و بڵێم دڵگەرمی و کەف و کوڵیان بۆ زانستەکان گەورەبوو، تێکڕایان داوایان کرد ببنە قوتابی خوێندنگە تازەکە"[1]. سەبارەت بەو پێشکەوتنانەی لە ماوەی خوێندندا بەدەستیانهێناوە دەڵێت: "لە ماوەی سێ مانگدا گەشتنە ئاستێك تیایدا هەر چوار حاڵەتی سێگۆشەی ڕاستەهێڵیان دەزانی"[2].

لە ڕاستیدا بەکارهێنانی دو توت دەرگایەکی فراوانی کردەوە بۆ هاتنەناوەوەی کاریگەریتی ئەورووپا بۆ ناو ئەستەمبوڵ. تەنها بەکارهێنانی لەگەڵ ئەفسەرە یاریدەرەکانیدا بەڵگەبوون لەسەر گۆڕانی تێڕوانین بۆ مەسیحییەکانی ئەورووپا. بارون دو توت یەکەم مەسیحی بوو، بەبێ ئەوەی بێتە ناو ئیسلام، لە بوارێکی هەستیاردا بەکاربهێنرێت، خۆی تێبینی ئەوەی کردبوو:" لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان موستەفا لە ئاست جێبەجێکردنی یاسادا زۆر توندبوو، یان بڕیارەکانی ڕەها بوون، ڕێگەی بە ئیمانداران نەئەدا ڕاژەی مەسیحییەکان قبوڵبکەن.."[3].

---

[1] DE TOTT: Memoires survles tures et les tartars. 4 Parties, Amsterdam1785.

[2] هەمان سەرچاوە، ج١، ل٩٢.

[3] هەمان سەرچاوە ل١١٦.

له سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم (١٧٧٣-١٧٨٩) دا کرانەوەیەکی بەرفراوان ڕوویدا، سەردەمەکەی چەندین هەوڵ و تەقەللای کارای بەخۆوەدیت بۆ چاکسازیکردن لە دام و دەزگا سەربازی و زانستییەکاندا[1]. بە تایبەتیش لە ماوەی وەزارەتی خەلیل حەمید پاشا (١٧٨٢-١٧٨٥)دا، ناوبراو پاڵپشت بەهاوکارییەکانی باڵوێزی فەرەنسی توانی ریفۆرمی سەربازی ئەنجامبدات، ئەوەبوو ڕاهێنەرو ئەندازیاری هێنا و ئەرکی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی قەبارەو قاڵبی تۆپەکان گەنجینەی دەریاوانی پێسپاردن، هەر بەهاوکاری ئەم فەرەنسییانە خوێندنگەیەکی بۆ ئەندازیاری دامەزراند، تیایدا مەعریفە نوێیەکان ئەوانەی پەیوەندیان بە هونەرە سەربازییەکانەوە هەبوو، دەخوێندران. سەبارەت بە هونەرە سەربازییەکان لە ماوەی ئەو قۆناغەدا چەندین کتێبی فەرەنسی کراونەتە تورکی و لە چاپخانەی باڵوێزخانەی فەرەنسیدا لە ئەستەمبوڵ چاپکراون[2].

ئەو باڵوێزەی فەرەنسا کە حەمیدی وەزیر لە ڕاپەڕاندنی ریفۆرمەکانیدا پشتی بەتواناکانی بەستبوو، شوازل گۆفێیە (Choiseul Gouffier)ی جێنشینی دالامبیر بوو، لە ئەکادیمیای فەرەنسی[3]، گۆفێیە لە ساڵی (١٧٩٤ن)دا وەك باڵوێزی فەرەنسا لای بابیعالی دامەزراوە، بە یاوەری نێردراوێکی گەورە لە کەسی شارەزاو ئەفسەرو و شێوەکارو تۆبۆگرافناس و شاعیرو کرێکار هاتووە بۆ ئەستەمبوڵ، ئەمە ئەو نێردراوە وەبیردێنێتەوە کە لە پاش چوار ساڵ لەو مێژووە لە هەڵمەتەکەیدا بۆ سەر میسر یاوەری ناپلیۆن کردووە،

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١١٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١١٩.

[3] Cavid baysun M.art abd al.hamid, Ei2,Vol. pp.64-65

ئەمانە لەو ڕیفۆرمانەدا کە حەمیدی وەزیر ئەنجامیدان، ڕۆڵێکی سەرەکیان گێڕا[1].

*لەو پرۆژانەی کە لە نێوان باڵوێزی فەڕەنسی و وەزیر حەمیددا گفتوگۆی لەبارەوە کرا، پرۆژەی هەناردنی خوێندکاری تورك بوو بۆ پاریس بۆ فێربوونی زانستە مۆدێرنەکان، هەروەها گفتوگۆ سەبارەت بە وردەکاریەکانی کرا، وەك سەرەتایەکیش بڕیاردرا سی (٣٠) خوێندکار ڕەوانە بکرێن، بەڵام پرۆژەکە سەرکەوتو نەبوو، چونکە حەمیدی وەزیر کە هەوڵ و تەقەللاکان و هەڵپەکەی خۆپارێزی کۆنەپارێزەکانی وروژاند، لەو ماوەشدا کاری بۆ لادانی سوڵتانی پیر عەبدولحەمید و دانانی سەلیمی برازای کردبوو، ئەم کەف و کوڵ و دڵگەرمیە لە گۆشەنیگای کۆنەپارێزەکاندا جۆرێك بوو لە کوفرو ناسزایی، ئەوەبوو بە یەکێك لە پیلانە زۆرو زەوەندەکانیان لە ساڵی (١٧٨٥ز)دا کوشتیان.

زۆری پێنەچوو دۆخەکە پەرەیسەند، جەنگ لە دژی ڕوسیا، کە هاوپەیمانی نەمسا بوو ڕاگەیەندرا، فەڕەنسا بێلایەنی خۆی لەم جەنگەدا پاراست، بۆ سەلماندنی ئەم بێلایەنییە شارەزایانی وڵاتەکەی لە ئەستەمبوڵ ڕاکێشایەوە. بەڵام قۆناغی جەنگ کە بە "پەیماننامەی جاسی Jassy"[2] کۆتایهات، بۆ سوڵتانی داهاتوو، کە دواتر یەکەم پرۆژەی سەراپاگیر بۆ چاکسازی دام و دەزگا سەربازی و کارگێڕی و دارایی و فێرکاریەکانی دەوڵەتی عوسمانی ڕادەگەیەنێت، بە تەنها قۆناغی چاوەڕوانی بوو.

---

1 Karal ,E.Z.la tanasformation de la turquie p.429

2 Pingaud ,L:Choiseul gouffier , LA France en orient , paris 1887. p.95

**نیزامی نوێ (نیزامی جەدید)**

پێش ئەوەی سەلیمی سێیەم بچێتە سەر تەخت[1] لە سالّی (١٧٨٩ز)دا، کاریگەری فیکری ئەورووپی بە شێوەیەکی گشتی و فەرەنسی بە شێوەیەکی تایبەت لە ئەستەمبولّ کاری خۆی دەکرد، ئەم کاریگەریانە لە ڕێگەی بالّوێز و شارەزاکانەوە کە بەشی زۆریان فەرەنسی بوون، دەهاتە نێو پایتەختی عوسمانییەوە، گفتوگۆو وانەکانیان لەگەلّ پیاوانی دەولّەت و فێرخوازانی زانستی عوسمانی بەشداریان لە پێشکەشکردنی پرنسیپگەلێك لە بیروباوەڕە باوەکانی ئەورووپای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم دەکرد. هەروەها کاریگەرێتی ئەورووپا لە ڕێگەی خودی نێردراوە عوسمانییەکانەوە ئەوانەی ڕەوانەی پایتەختەکانی ئەورووپا دەکران و لە نزیکەوە ئاشنادەبوون بە سیماکانی پێشکەوتنی ئەورووپی بۆ نێو ولآتی عوسمانی، دەپەڕییەوە.

سولّتان سەلیمی سێیەم، کە بە کەش و هەوای ڕیفۆرم و بە پێشکەوتنی ئەورووپا کاریگەرو سەرسامبو، پێش ئەوەی لە سالّی (١٧٨٦ز)دا، بچێتە سەر تەخت، نێردراوێکی بۆ لای لویسی شانزەهەم ڕەوانەکردبوو [2]، نێردراوەکە ئیسحاق بەگ بو، و فەرەنسیەکی باشی دەزانی، نامەیەکی سولّتانی داهاتووی بۆ پاشای فەرەنسا پێبوو، کە خودی گۆفێی بالّوێز لە دارشتنەوەیدا هاوکاریکردبوو. ئامانجی سەلیم جەختکردنەوە بو لەسەر پەیوەندیی دۆستانەی نێوان هەردوو ولآتی عوسمانی و فەرەنسی و داوای هاوکاریی سەربازیشی کردووە لە دۆخێکدا ئەگەر پێویستبوو.

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٨٤.

[2] بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية.ص٤٨٣.

له زەینی سوڵتاندا بە تەنها نەوەستان لەسەر پێشوازیکردن لە شارەزایان، ڕەوانەکردنی نێردراوەکان، پێویستی ئەنجامدانی بەرنامەیەکی چاکسازی سەراپاگیر بۆ دام و دەزگاکانی دەوڵەت، بیرۆکەیەك بوو جێگیر. بۆچوونێکی تریی هەبوو تەواوکەری ئەوەی یەکەم، ئەویش ئەوەبوو پێویستە ڕیفۆرم بەهاوکاری فەرەنسا ئەنجام بدرێت. لە ڕاستیشدا بەرپابوونی جەنگ لەگەڵ ڕووسیاو کشانەوەی شارەزا فەرەنسیەکان و گۆڕانی سیستێمی سیاسی لە وڵاتی فەرەنسا لە ساڵی چوونە سەر عەرشیدا، هیچی لە بەرنامەکانی ئەم سوڵتانە نەگۆڕی.

یەکەم کاری سوڵتان لەدوای مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتبوونەوە لەگەڵ ڕووسیا لە ساڵی (١٧٩٢)دا، بانگهێشتکردن بوو بۆ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری "مجلس مشورت" کە پلە پلەو پاش ماوەیەك پەرەیسەندو بوو بەدەستەیەکی حکومی و سەرجەم پاریدەرەکانی سوڵتان و دیارترین پیاوەکانی دەوڵەتی لەخۆدەگرت. شتێکی نوێ کە سوڵتان لە کاتی پێکهێنانی ئەم ئەنجومەنەدا دایهێنا، بەشداریپێکردنی دوو کەسایەتی ناموسڵمان بوو تیایدا، یەکەمیان فەرەنسیەك بوو بەناوی (Bertrand) و ئەوی تریان ئەرمەنیەك بو بەناوی (Mouradgea d Ohsson)، کە یەکێك بوو لە گەورە وەرگێڕەکانی باڵوێزی نەمسا لە ئەستەمبوڵ. ئەمانە لە میانەی گفتوگۆو پێشکەشکردنی پێشنیارەوە بەشداریان دەکرد، ئەمەی دواییان لەو بڕیارانەدا کە تایبەت بوون بە گرێدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ وڵاتە ئەوروپیەکان، ڕۆڵی خۆی گێڕاوە[1].

[1] سەبارەت بە قۆناغی سەلیمی سێیەم دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەم سەرچاوانە: تاریخ جودت، تاریخ الدولة العثمانیة لـ هامر Hammer و بۆ مێژووی عاصی، ئەمەی دواییان

ئەم هەنگاوەی سەلیمی سێیەم زیاد لە مەغزایەکی هەبوو، بە رویەکدا بەڵگەبوو لەسەر تێپەڕاندنی ئەو یاسایانەی کە بەربەستبوون لە بەردەم بەکارهێنانی ناموسڵمانەکان لە کاروباری سیاسیی هەستیاردا، هەروەها خواستی پتەوکردنی کرانەوەو و بانگهێشتکردن بۆ دزەکردنی بیروباوەڕەکانی ئەوروپا بۆ ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، مەبەستی لەم کارە پێدەچێت ویستبێتی متمانەی وڵاتانی ئەوروپا بە تایبەتی فەڕەنسا بە ڕیفۆرمەکانی ڕابکێشێت.

لە نێو ئەنجومەندا بیرۆکەو ڕاپۆرتگەلێکی زۆر خراونەتەڕوو، کە ئەندامەکان بەشداریان سەبارەت بە گفتوگۆکردنی دەکرد، لە گفتوگۆکاندا جەخت لەو مەسەلانە کراوەتەوە کە پەیوەندییان بە داتەپین و گلۆربوونەوەی دەوڵەت و گەندەڵی کارگێڕییەکەی و ئیفلاسکردنی دارایەکەیەوە هەبوو، کە ڕاپۆرتی عوسمانییەکانی سەدەی حەقدەهەم وەبیردێننەوە، چونکە مەسەلەکان کە دەخرانەڕوو، هاوشێوەبوون: سوپا، زانایان، دارایی، کارگێڕی. بەڵام پەرەسەندنی نوێ لەم ڕاپۆرتانەدا کە دەخرانە بەردەم سەلیمی سێیەم، بریتیبوو لە پێشنیازکردنی ڕێگەچارە، بەتایبەتیش کە پشتبەستن بە هاوکاریەکانی ئەوروپا لای هەندێك زەمینەبوون بۆ ڕاپەڕاندنی چاکسازیەکان[1].

---

مێژوویەکی بۆ دەوڵەت نووسیومەتەوە لە نێوان سالانی ١٧٩١-١٨٠٨. واتە تەواوی قۆناغی سەلیمی سێیەم بەتایبەتیش ئاماژە بۆ ئەم لێکۆڵینەوە نوێیە دەکەین.

SHAW,S.J :Between old new,the ottoman Empire under Selim III 1789- 1807 , Harvard univ , press. 1971

(1) سەبارەت بەم ئەرکەی ئیسحاق بەگ و نامە گۆڕینەوەکانی نێوان سەلیمی سێیەم و لویسی شانزە بڕوانە: munir pacha,S:Louis XVI et le Sultan salim R.H.D. 26, 1912 PP. 516-548

گفتوگۆکـان ڕاگەیانـدنی "نیزامـی جەدیـد"Nizam i-cedidی لێکەوتەوە (لە ساڵی ١٧٩٣.و.)، کە بریتیبو لە کۆمەڵێك تەنزیمات، ئامانج لێی ئەنجامدانی چەندین ڕیفۆرم و چاکسازی بوو لە هەردوو بواری سەربازی و دارایدا[1].

پێدەچێت خـودی تێرمەکـە "نیـزام جەدیـد" بـۆ پیشـاندانی ئـارەزووی دابڕان لەگـەڵ سیسـتێمە کۆنەکـە، کـە دام و دەزگاکـانی ئینکیشاری و زانایاندا نوێنەرایەتیان دەکرد، پەیڕەوکرابێت. چونکە ناوەکە لە بازنـەی عوسمانیـدا نـوێ بوو، دورنیە هەڵبـژاردنی لـەژێر کـارتێکردنی ئـەو گوزارشـتەدا بوبێـت، کـە لـە شۆڕشـی فەڕەنسـیدا بـەکارهاتووە و تیایـدا سیسـتێمی پاشـایەتی بـە سـیتێمێکی کـۆن وەسـفکراوە، بەرامبـەر سیسـتێمی نـوێ کـە شـۆڕش نوێنەرایـەتی دەکرد. لەوەش زیـاتر، یەك لە یاریـدەرەکانی سـوڵتان ڕیفۆرمـەکان و چوونە سەر عەرشی سەلیم بە "شۆڕشی شادی" وەسفکردوە، لەگەڵ ئـەوەی کـە گوزارشـتی شـۆڕش تـا ئەوکاتـە مانـای ئـاژاوە و فیتنـەی لەخۆگرتبوو.

نیزامـی نـوێ جـەختی لەسـەر ئەنجامـدانی ڕیفـۆرم کردۆتـەوە لـە بواری سەربازیدا، ئەوەبو لە دەرەوەی بازنـەی سـوپای ئینکیشـاریدا، سوپای نیزامییان پێکهێنا، کە بریتیبو لە (١٢٠٠) سـەرباز، بۆ ئـەم مەبەستە سەربازگەی نوێیان بۆ سوپای نوێ بوونیادنا، بەتایبـەت لـە (Secutari)، لـە دەرەوەی ئەسـتەمبوڵ کـە تیایـدا شـارێکیان بـە خوێندنگـە و مزگـەوت و شـۆرگەکانیەوە بـەرزکردەوە[2]، ئامـانجی سـوڵتان لـەم کـارە دورخسـتنەوەی سـوپاکەی بـو لـە گوشـاری

[1] SHAW ,S. J :Between old and new pp 86 -120

[2] هەمان سەرچاوە، ل٩٣.

ئینکیشاریەکان. هەروەها بەپێی "نیزامی جەدید" چەندین ڕیفۆرمی تر ئەنجامدران، کە ئەم بوارانەی خوارەوەی دەگرتەوە:

سیستمی ئازوقە لە سوپاداو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی بۆدی تۆپ و پتەوکردنی سەنگەرسازی و بەرگرییەکانی لە دەروازەی تەنگەی بۆسفۆرو دەوروبەری پایتەختدا.

لەو سیستمانەی پەیڕەوکران، بەکاربردنی سیستێمێکی دارایی نوێ بو، کە پێی دەوترا "ایرادی جەدید"Iradi-I- Cedid [1]، بۆ دابینکردنی خەرجیی دام و دەزگا نوێکان. لە پڕکردنەوەی دارایی دەوڵەتیشدا بەتایبەت کەرتەکانی سوپا، پشت بە داهاتەکانی زەوی بەسترا،، هەروەها باجی نوێیان لەسەر بەروبوومە کشتوکاڵیەکان دانا.

سوڵتان گرنگی بە دامەزراندنی خوێندنگەو پەیمانگا فێرکارییەکان دا، ئەوەبو جارێکیتر خوێندنگەی ئەندازەی بە کارگێڕییەکی نوێی فەڕەنسی و ئینگلیزی ڕێکخستەوە، خوێندن تیایدا بۆ چوار ساڵ بوو، لەو ماوەدا بابەتە زانستییەکانی وەك حیساب و ئەندازەو جوگرافیاو جەبرو حیسابی سێگۆشەکان دەخوێنران، هەروەها تیایدا بابەتەکانی مێژوو و زمانەکان دەوترایەوە، لە ساڵی یەکەم و دووەمی خوێندندا لەگەڵ زمانی عەرەبیدا زمانی فەڕەنسیش دەخوێنرا [2].

لە هەمان کاتدا چاپەمەنی جوڵەی هاتەوەبەر، چاپخانە کۆنەکەی موتەفەڕیقە خرایەوەگەڕ و کارگێڕییەکی نوێی بۆ دانرا، هەروەها لە خوێندنگەی ئەندازیاریدا بە سەرپەرشتی عەبدولڕەحمان ئەفەندی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١١٢ و دواتر.

[2] سەبارەت بە ڕێکخستنە سەربازییەکانی سەلیمی سێیەم بڕوانە:

Raif , M. ، Tableau des nouveaux reglements de L'empire ottoman Constaninople 1798

چاپخانەیەکی نویٚ کرایەوە کە لە نێوان ساڵانی (١٧٩٣-١٨٠٠ن)دا نزیکەی پەنجا (٥٠) کتێبی چاپکردووە، لە نێویاندا چەندین کتێب هەبوون بە زمانی فەڕەنسی[١].

سەرباری ئەمانە سوڵتان لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپادا شێوازێکی نوێی مامەڵەکردنی گرتەبەر، بۆ یەکەم جار لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا باڵوێزخانەی هەمیشەیی لە پایتەختەکانی ئەوروپادا دانران. لەم چوارچێوەدا "حکوومەتی بەڕێوەبردن" لە پاریس داوایکرد لە پایتەختی وڵاتەکەیدا باڵوێزخانەیەکی هەمیشەیی عوسمانی بکرێتەوە، کە لە ئاست باڵوێزخانەی فەڕەنسیدا بێت لە ئەستەمبوڵ، لە بازنەی پرنسیپی مامەڵەی هاوشێوەدا، سەلیمی سێیەم بە تەنها باڵوێزی خۆی ڕەوانەی پاریس نەکرد، بەڵکو باڵوێزەکانی خۆی هەنارد بۆ لەندەن و پترسبۆرگ و بەرلین و ڤیەننا[٢]. ئەم نێردراوانە نزیکایەتی لە نێوان وڵاتانی ئەورووپا و دەوڵەتی عوسمانیدا هێنایە ئاراوەو بای گۆڕانی گواستەوە بۆ ناوەوەی عوسمانی و بوون بە دەروازەیەك بۆ کرانەوە کە لەگەڵ ڕۆژگاردا بەرین وفراوانتر دەبوو.

پرۆژەکانی سەلیمی سێیەم لە مێژووی عوسمانیدا یەکەمین هەنگاوی ڕیفۆرمخوازیان پێکهێنا، بۆ یەکەم جاریش بەرنامەیەکی ڕیفۆرمخوازی سەراپاگیر دام و دەزگا سەربازی و دارایی و کارگێڕی و فێرکارییەکان بکاتە ئامانجی خۆی، ئەو بەرنامەی کە لە نوێکاریدا بە شێوەیەکی یەکجارەکی پشتی بە نموونەی ئەورووپی بەستبو.

---

[١] هەمان سەرچاوە.

[٢] Berkes,N: The development of secularism pp. 75

له دەوڵەتێکدا کە مێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆ سەدەکانی ناوەند، ئەم ڕیفۆرمانە جۆرێك بو لە کودەتا. یەکێك لە ئەفسەرە فەرەنسیەکان ڕووداوەکانی ئەستەمبوڵی سەردەمی سەلیمی سێیەمی بەچەشنێك وەسفکردوە، کە گوزارشتە لەم کودەتایە بەو چەشنەی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ سەردەمی نوێدا گرێداوەتەوە، دەڵێت: " لە سەرەتای سەدەی پانزە سوڵتان سەلیم پرۆژەیەکی ئامادەکرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی سوپای ئینکیشاری و وێرانکردنی ئاواتەکانی زانایان و نەهێشتنی دەسەڵاتی موفتی، کە هاوشانی دەسەڵاتی تەشریعی سوڵتان بوو.. سوڵتان خواستی وابو میللەتەکەی نوێ بکاتەوە بە بەشداریپێکردنیان لە دۆزینەوە ئەوروپیەکان لە بوارەکانی هونەرو زانست و پێشکەوتنی کشتوکاڵ و بازرگانی و شارستانیەتدا"[1].

## ڕۆڵی فەرەنسا لە ڕیفۆرمدا

فەرەنسیەکان لە سەرخستنی پرۆژەکانی ڕیفۆرمدا ڕۆڵێکی ئەکتیڤ و بنچینەییان هەبوو، لە وانەو ڕاهێنان و بەڕێخستنی دام و دەزگا سەربازییەکاندا ئەفسەرو تەکنیککارو شارەزایانی ئەوان هاوکارو یاریدەربوون، ژمارەیەکی کەم لە ئەوروپیەکانی تر لەوانە ئیتالی و نەمساییەکان بەشداریان تێداکردووە[2]. سەبارەت بە سوڵتان ئەم کۆمەك و هاریکارییە جۆراوجۆرەی فەرەنسییەکان مەسەلەیەك بوو هەڵاتنی بۆ نەبوو، تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی هەرەشەی ڕووسیاو ئینگلیزیش بوایە وەك چۆن لە دوا ساڵەکانی سەردەمەکەیدا لە نێوان ساڵانی (١٨٠٦-١٨٠٧ن) ئەمە ڕویدا.

---

[1] Shaw,S,J :Between old and anew pp.184

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٨٨.

سـەبارەت بـە فەڕەنسـيەكانيش، لـەوديو ئـەم كۆمـەك و هاوكاريانـەوە ئامـانجى جۆراوجۆريـان هـەبوو، بەڕوويەكدا مەبەست لێى بەگژداچونەوەى مەترسى و هەڕەشەكانى ڕووس و ئينگليز بوو، بەڕويـەكى تريشـدا خواسـتى گەيشـتن بـوو بـە ئاسـيا، لەوێشـەوە بەگژاچونى دەسەلأتى ئينگليزيى لە هيندستان. پێويستە ئەوە بڵێين كە كەف و كوڵى پياوانى سەردەمى شۆڕش لە فەڕەنسا پاڵنەرێك بوو بـۆ بلأوكردنـەوەى بيروبـاوەڕە شۆڕشـگێڕيەكانيان و لـە وڵاتـانى ئەورووپا يان لە دەرەوەى بازنەى ئەورووپيدا[١].

لە واقعيشدا ئەو كاتەى سوڵتان ئامادەكارى بۆ پـرۆژەى نيزامى نـوێ دەكـرد، كۆمـەك و هاوكارييـە پێشـبينيكراوەكانى فەڕەنسـاى لەپێشچـاو دەگـرت، ڕاستەوخۆ دواى ڕاگەيانـدنى نيزامـى نـوێ، لـە پـايزى سـاڵى (١٧٩٣ز)دا بابيعـالى بـە مەبەسـتى جێبـەجێكردنى ڕاهێنـان و مەشـقە پێويسـتەكان و بـەڕێوەبردنى پەيمانگـە نوێكـان و ڕانەوتنـەوە بـە خوێنـدكارەكان لـە پەيمانگـەكان و ڕاهێنانيـان بـە هونەرەكانى جەنگ و زانستەكان ومێژوو و زمـانى فەڕەنسـى، كە لـە هەنـدێك لـە پەيمانگەكانـدا بـە ناچـارى دەخوێنـدرا، ليسـتێكى بـە پێداويسـتێكانى دەوڵـەت بـۆ ئەفسـەرو تـەكنيككار هـەناردبوو[٢]. ئـەوەبوو حكومـەتى فەڕەنسـى داواكارييـەكانى دەوڵـەتى عوسمـانى جێبەجێكرد، ناپليۆن لە ساڵى (١٧٩٤ز)دا بيرى لـەوە كردۆتـەوە وەك سەرپەرشتيارى سوپاى تۆپخانـە لـە خزمـەت سوڵتاندا ڕاژەبكـات[٣]. ڕاتب ئەفەندى، كە لە ساڵى (١٧٩٥ز)دا پۆستى سـەرۆكى نووسـەران

---

[1] Saint-denys, J:Revolutions de Constantinople, paris 1819, tome I pp.VII-VIII

[2] Lewies , B:The impact of French Revolution of Turkey.Journal of world history.1. 1953 p.109

[٣] هەمان سەرچاوە، ل١١٧.

یا وەزیری دەرەوەی بەدەستبوو، لیستێکی هاوشێوە، بەڵام چڕترو قەبارە گەورەتری لەوەی یەکەم بۆ لێژنەی ڕزگارکردنی گشتی Salut Public بەرزکردۆتەوە، ئەوەبوو وڵاتی فەڕەنسا لە ساڵی (١٧٩٦ز) دا Du bayet ی باڵوێزی بە یاوەری تیپێکی فراوان و بەرین لە شارەزایان و ئەفسەران ڕەوانەکرد بۆ ئەستەمبوڵ"[1].

بەڵام بەهۆی داگیرکردنی ناپلیۆن بۆ میسر، پەیوەندیەکانی فەڕەنسا و دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان ساڵانی (١٧٩٨و ١٨٠٢)دا، پچڕان، ئەوەش شوێنەواری خراپی لەسەر بەڕێوەچونی ڕیفۆرمەکان بەجێهێشت، چونکە سوڵتان سەلیمی سێیەم جەنگی دژ بە کۆماری فەڕەنسا ڕاگەیاند و باڵوێزی فەڕەنسای لە ئەستەمبوڵ دا دەستبەسەرکرد[2]. سەرباری ئەوەی ناپلیۆن گەنگەشەی بۆ ئەوەدەکرد، گوایە ئەو بەناوی سوڵتانەوە هاتووە بۆ میسرو دوژمنی مەمالیکە، نەك عوسمانییەکان، بەڵام ئەوە توڕەبوونی سوڵتانی کەمنەکردەوە، کە بەرپرسیارێتی خۆی لەئاست وڵاتێکی ئیسلامی، کە ویلایەتێکیش بوو لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی، هەستپێکردبوو.

فەڕەنسا گۆڕا بۆ وڵاتێکی دوژمن، باڵوێزی ڕووسیا لە ئەستەمبوڵ ئەم مەسەلەی هان و دنە داوە هەروەها هێزە کۆنەپارێزەکانیش، ئەم مەسەلەیان کردە بەهانەیەك بۆ لێدانی ڕیفۆرمەکان. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیە دۆستانەکەی عوسمانی– فەڕەنسی بەڕێکەوتنی ئاشتی ساڵی ١٨٠٢ز (ڕێکەوتنی ئامینس.و.) گەڕایەوە دۆخی جاران، نێردراوەکانی فەڕەنسا بە شارەزا و ئەفسەرەکانیانەوە جارێکی تر گەڕانەوە بۆ ئەستەمبوڵ، بەڵام

---

[1] Saint- denys,J:revolutions de Constantinople.tome 2, pp.12

[2] Berkes.the development pp.76

سوڵتان خۆی لە دۆخێکی شپرزەدا بینییەوە پاش ئەوەی ناپلیۆن داوای لە بابیعالی کرد وەك ئیمپراتۆرێك دانیپیابنێت، ئەم کارە بەهۆی گوشارەکانی ڕووسیا و ئینگلیزەوە ڕاستەوخۆ ڕوینەدا، بۆ نەرمکردنی هەڵوێستی سەلیمی سێیەم نامەکەی ناپلیۆن سوودێکی نەبوو، بەڵام هەوڵ تەقەللاکانی فەرماندە سباستیانی Sebastiani لە کۆتاییدا بەروبومی خۆی هەبوو، کە بووە مایەی ڕاگەیاندنی جەنگ دژ بە ڕووسیاو هەڕەشەکردنی کەشتیگەلی ئینگلیزی لە خودی ئەستەمبول[1].

ڕۆڵی فەڕەنسا لەگەڵ سباستیانیدا کە لەساڵی (١٨٠٦ز)دا گەیشتە ئەستەمبوڵ، گەیشتە تروپکی خۆی، دوای زنجیرەیەك پەرەسەندنی سیاسی و سەربازیی کە بوونە هۆی بەرپابوونەوەی جەنگی ڕووسی-عوسمانی و هەڕەشەکردنی بریتانیا بە تۆپبارانکردنی ئەستەمبول ئەگەر باڵوێزی فەڕەنسا دورنەخاتەوە. سوڵتان و یاریدەرەکانی تووشی شۆك بوون کە دیتیان کەشتیگەلی ئینگلیزی هاتۆتە سەر ئەستەمبوڵ، بەڵام سباستیانی زانی چۆن دۆخەکە لە بەرژەوەندی وڵاتەکەی قۆرخدەکات، بەرهەڵستیەکی جەماوەری ڕێکخست و پرۆسەی سەنگەرسازیەکانی ئەستەمبوڵی خستە سەر ئەستۆی خۆی، ئاکام ئینگلیز ناچاربوو کەشتیگەلەکەی بکشێنێتەوە[2].

[1] Lewis, B :The impact of French p.110

[2] بۆ وێنە بڕوانە:

Kabrda , J:Quelques firmans concernant les relatione franco-turques lors de L'expedition de Bonaparte en Egypte 1798-1799 , publications de La societe Asiatique paris 1946

ڕۆڵی فەڕەنسا بەحوکمی دۆخەکە سیفەتێکی سەربازانەی هەبوو، لەگـــەڵ ئەوەشـــدا بەتـــەنها بـــەم بـــوارەوە نەوەســـتان، بـــەهۆی پەیوەندیـەکانی نێـوان خوێنـدکارو سـەربازو پیـاوە حوکمڕانـەکانی عوسمانیی لە لایەك و ئەفسەرو شارەزا فەڕەنسییەکان لەلایەکی تر، جۆرێك لـە سـۆزی عوسمـانی بەرامبـەر ئـەو ڕێکخـەر و ئالیکارانـەدا دروسـتبوو، ئـەم سـۆزە لـە هـەناوی گفتوگـۆ درێژخایەنەکانـەوە سەرچـاوەیان دەگـرت، کـە لـە بازنـەی بەرنامـەی وانـەو ڕاهێنانـەکان لایدەداو تا ئاسۆگەلێکی بێسنوور دەڕۆیشتن.

بە ڕویەکی تردا سەپاندنی خوێندن بە زمانی فەڕەنسی ژمارەیەك عوسمانی هێنایە بوون، کە بەم زمانە گفتوگۆ و خوێندنیان بە باشی ئـەنجام دەدا، ئیـدی ئەستەمبوڵ ژمارەیـەك لـە کوڕانی نـەوەی نوێی کراوەی بە ڕووی مەعریفەی نوێدا ناسیی، ئەم ڕۆشنگەرانە لە نەوەی نوێ توانییان لەو کتێبخانانەدا کە پاشکۆی خوێندنگەی ئەندازیاری و پەیمانگـەکانی تربـوون، کتێبـی هەمـەڕەنگ بـە زمـانی فەڕەنسـی بخوێننـەوە، کتێبخانـەی خوێندنگـەی ئەنـدازیاری نزیکـەی (٥٠٠) کتێبی تیادابوو، کە زۆربەیان بە زمانی فەڕەنسی نوسرابوون، لە نێو ئەوانەدا ئەنیسکلۆپیدیای فەڕەنسی و هەندێ لە کتێبەکانی ڤۆڵتێرو چەندین بیرمەندو زانای تر هەبوون[1].

## پڕوپاگەندەی فەڕەنسی

بیروبـــاوەڕە فەڕەنســـیە شۆڕشـــگێڕییەکان بـــۆ دزەکردنـــی ڕێکـــەوتنکاریی (تســـرب اتفـــاقی) یـــان بـــۆ دۆخ و ڕێکەوتـــەکان جێنـەهێڵرابوون، سـەبارەت بـە پیـاوانی حـوکمی شۆڕشـگێڕیش لـە

[1] Shaw, S.J :Between old and [redacted] pp.328-340

ڕەنسا، دژەکردنی بیروباوەڕە شۆڕشگێڕیەکان و دروشمە تازەکان
س نەبوون، کە لە میانەی بەریەککەوتنی تاکەکەسییەوە ڕوبدەن،
ۆڕشی فەڕەنسی لەگەڵ بەرپابوونیدا ڕێبازێکی فرە جەمسەری
رتەبەر بە ئامانجی دژەکردنی بیروباوەڕەکانی بە سەرجەم
وچەکانی دونیادا، دەوڵەتی عوسمانی بە هەرێم و ویلایەتە زۆرو
ەوەندەکانیەوە لە یەکەمین ناوچەکان بوو، کە لە دەرەوەی ئەوروپا
ئرابێتنە بازنەی گرنگییپێدانی پیاوانی سیستێمی نوێوە لە پاریس،
ەم ڕووەوە چەندین پلان و بەرنامە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی
ئۆڕش و دروشمەکانی و بۆ سیستەمی حوکمڕانی لە فەڕەنسا
ارێژران.

لە ئەستەمبوڵ دا، باڵوێزی فەڕەنسی لە میانەی چاپخانەکەیەوە
ەچاپدانی کتێبە زانستیەکاندا بە هەردو زمانی فەڕەنسی و تورکی
بەشداریکردوە، لە ساڵی (١٧٩٥ز)دا Louis Allier ی بەڕێوەبەری
چاپخانەی نیشتیمانی لە پاریس، بۆ پشتگیریکردنی گەنگەشەی
فەڕەنسی لە بازنەی پلان و بەرنامە پەیڕەکراوەکانی حکومەتی
فەڕەنسیدا، چاپخانەیەکی هەنارد بۆ باڵوێزخانەی وڵاتەکەی لە
ئەستەمبوڵ[1]، ئەوەبوو لەژێر ناونیشانی "گۆڤاری فەڕەنسی لە
ئەستەمبوڵ"[2] بڵاوکراوەیەکی مانگانەی چاپکرد، هەروەها
بڵاوکراوەیەکی تری بە ناونیشانی "بڵاوکراوەی لیژنەی کۆماری
فەڕەنسا لای بابیعالی"[3] دەرکرد. بێجگە لەوەش ئەو چاپخانەی کە
سەر بە باڵوێزی فەڕەنسی بو لە ئەستەمبوڵ، چەندین مانیفێست و

---

1 هەمان سەرچاوە، ل٢٣٤-٢٣٩.

2 Lewis, B:The impact of French pp. 109

3 shaw, S. J. :between old and new pp.195

دیکۆمێنتی وەك "دەستوری کۆماری" و ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ" و چەندین دیکۆمێنتی شۆڕشگێڕانەی تری فەڕنسی بلاوکردەوە[1].

ئەم چالاکییە گەنگەشەکاریە بۆ دوو مەبەست ئەنجام دران، بەڕویەکدا بۆ هێشتنەوەی پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەست و نیشتەنییە فەڕەنسیەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بەڕویەکی تردا بۆ بلاوکردنەوەی گەنگەشە لە نێو خودی عوسمانییەکاندا، یەکێك لە پیاوانی ئیدارە لە پاریس بەم شێوە گوزارشتی لە ئامانجەکانی دانانی چاپخانە لە ئەستەمبوڵ دا کردوە، دەڵێت:" پێویستە چاپخانە خزمەت بە دوو ئامانج بکات، کە لە ڕوی بایەخەوە وەك یەکن. یەکەمیان وریاکردنەوەی ئەو هاوولاتیانەی نیشتەجێی ڕۆژهەلاتن سەبارەت بە پرس و کێشەکانی کۆماری، دووەمیشیان بەخشینی هەلێك بە تورکەکان بۆ ناسینەوەی کتێبە گشتییەکان، ئەوانەی تامی ئەو زانستانەیان پێدەبەخشن کە گرنگی هەیە بۆیان"[2].

بەلام وەرگێڕانی ئەو دیکۆمێنتانە بۆ زمانی تورکی ئاسان نەبوو، بەتایبەت لە ڕوی گواستنەوەی زاراوە و تێرمە نوێیەکانەوە بۆ زمانی تورکی، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە تورکەکان و ئەوانەی لە کارگێڕی عوسمانیدا کاربەدەستبوون، کۆمەکیان بە چالاکیەکانی بالوێزی فەڕەنسی کرد، لەوانە Mouradgea ی ئەرمەنی کە ئەکتیڤانە بەشداری لە وەرگێڕانی بلاوکراوە فەڕەنسیەکاندا کردووە.

شایەنی وتنە ئەو فەڕەنسییانەی نیشتەجێی ئەستەمبوڵ بوون لە میانەی پێکهێنانی ئەو یانەو کۆمەلانەی لەنێو خودی ئەستەمبوڵ دا دایانمەزراندبو، لە بلاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی فەڕەنسادا ڕۆڵی

---

[1] LA Gazette francaise de Constantinople

[2] Le Bulletin de la legation de la republique francaise pres de la porte

خۆیـان گێـڕاوه، لـه گـرنگترین ئـهو کۆمهڵانـه ئـهوهیان بـوو کـه دو کورشDes corches له ساڵی (١٧٩٣ن)دا به ناوی "کۆمهڵهی کۆماری بـۆ دۆسـتهکانی ئـازادی و یهکسـانی" دایمهزرانـدبوو. دوابـهدوای ئهویش لههـهمان ساڵدا "کۆمهڵهی جهماوهریی کۆماریی" لـه لایـهن هیـنـنHinin وه دامـهزرا، لهمـه زیـاتر، یاقوبیـه فهڕهنسـیهکان لـه ئهستهمبوڵ دا بانگهێشتیان بۆ سازدانی ئاهـهنگی گشـتی دهکرد و سهبارهت به مافهکانی مرۆڤ و خراپهکانی سیستمی کۆن دهدوان و ماناکانی ئازادی و یهکسانی و برایهتیان ڕوندهکردهوه[1].

بێجگه له کتێب و ڕۆژنامه، که باڵوێزی فهڕهنسا وهك پڕوپاگهنده بڵاویدهکردنـهوه و بێجگـه لـه چالاکیی فهڕهنسیهکان لـه ئهسـتهمبوڵ دا، کارگێڕی فهڕهنسـی فۆرمێکی تـری پڕوپاگهندهی بۆ بیروباوهڕ و سیاسهتهکانی بهکاردههێنا.

دیکۆمێنته شۆڕشگێڕییهکان له پاریسدا بۆ زمانی جیاجیای وهك یۆنانی و عهرهبی و ئهرمـهنی و تورکی وهردهگێڕدران، بۆ ئهوهی لـه ویلایهتـهکانی دهوڵـهتی عوسمانیـدا دابـهش و بڵاوبکرێنـهوه، بـۆ سهرپهرشـتیکردنی وهرگێڕانـی ئـهم بڵاوکراوانـهش بـه سـهرۆکایهتی لـویس لانگلـیسLouis Langlies ئۆفیسـێکی تایبـهت لـه پـاریس کرابـووه[2]. بـۆ نموونـه مانیفێسـتی کـۆنگرهی نیشـتمانی سـاڵی (١٧٩٤)، که ئاڕاستهی گهلی فهڕهنسا کرابو بۆ سهر زمانی عـهرهبی وهرگێـڕدراو لهگـهڵ دهقـه فهڕهنسـیهکهیدا لـه ئامیلکهیهکـدا لـه ویلایهتهکانی ڕۆژههڵاتدا بهسهر خهڵکدا دابهشکران[3].

---

1 shaw S.J. Between old and new p. 196

2 Lewis B. : the impact…….p117

3 Lewis B. : the impact…….p117

پڕوپاگەنـــدە بەشـــێوەیەکی تایبـــەت ئاڕاســـتەی ڕەعیەتـــە مەسیحییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە یۆنـان و ئەورووپای ڕۆژهـەڵات بەگشـتی کـران، ئەوانـە بیروبـاوەڕە نوێیـەکانیان زیـاتر وەردەگـرت، بەرادەیـــەك مەترســـی و تـــوڕەیی هەنـــدێ لـــە کاربەدەســـتە عوسمانییەکانی وروژاند. لەم ڕووەوە خالد ئەفەندی باڵوێز لە پـاریس داوایکرد سنوورێك دابنرێت بۆ گەنگەشەی فەڕەنسی لە دورگـەکانی ڕۆژهـەڵات و یۆنـان. تـا ئـەو ئاسـتەی داوایکـرد لەلایـەن کڵێسـای یۆنانیـەوە لێکۆڵینـەوە بکرێـت، بۆ قەدەغـەکردنی خوێندنـەوەی ئـەو مانیفێستانەش ئەگەر هەبوون یان دەرکەوتن، فەرمانێك دەربکرێت.

بەدیوێکی تریشدا فەڕەنسییەکان بۆ ئەوەی سۆزی موسڵمانەکان ڕابکێشن خۆیان وەك دوژمنی کاتۆلیك و پاپا پیشاندا، و هەوڵیانـدا لـە میانـەی ئـەم سیاسـەتەوە هاوسـۆزییەکی ئیسـلامی بەرامبـەر فەڕەنسـا بخـولقێنن. لـەم ڕووەوە یـەکێك لـە ڕاپۆرتـەکان دەڵێـت: "نێردراوەکـانی حکومـەتی شۆڕشـگێڕی توانییـان هاوسـۆزیەك تەنانـەت لـە نێـو دیوانیشـدا بخـولقێنن، بـۆ نموونـە جـەختیان لـەم خاڵـەی خـوارەوە کردۆتـەوە: "فەڕەنسـا دوای پـەیڕەوکردنی ئـاینی عەقڵی ئەوەی تێپەڕاند کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا بکەوێتە ناکۆکیەوە، نێردراوەکانیش لە ئەستەمبوڵ دا هاوڕێیان پەیداکردووە"[1].

پاشـتریش لـە سـەروبەندی سـەردەمی کۆمارییـدا لـە فەڕەنسـا لـە سـاڵی (١٨٠٧)دا ڕاگەیانـدنێك بـە هـەردوو زمـانی عـەرەبی و تـورکی بڵاوکرایـەوە کـە حەقیقەتەکـەی نەشـاردرایەوە، وەك بڵێـی لایـەنێکی فەرمی عوسمانی بڵاویکردبێتەوە[2]، بانگهێشتی موسڵمانەکان ببنـە پاڵپشـت بـۆ سیاسـەتەکەی نـاپلیۆن دژ بـە ڕووسـیا، ڕاگەیاندنەکـە

---

[1] Lewis B.:the impact p..117

[2] هەمان سەرچاوە، ل١١٠.

دەڵێت: "ئـەوە بـزانن کـە هـاوڕێی دێرینـی موسـڵمانەکان، دەرگـای خۆشەویسـتی بۆیـان کردۆتـەوە، وڵاتـی فەڕەنسـاش دۆسـتایەتی و خۆشەویسـتی دێـر زەمانـەی خـۆی لەگـەڵمان بیرنەچـۆتەوە. ئـەم دۆستایەتیە لەسەر بناغەی بەرژەوەندی هاوبەش درووستبووە، هـەر باشـە و خراپەیـەك ڕوو لـە ئیسلام بكات، ڕوویـش لـە فەڕەنسییەکان دەکات.." هـەروەها ڕاگەیاندنە دەڵێت: " برایان شاراوە نییـە لاتـان وڵاتی فەڕەنسا بەهۆی ئەو بەڵاو مەینەتیانەی کە بە سـەریدا هـاتن، پەرێشـان و مانـدوو بـوو، سـەرجەم وڵاتـانی ئـەورووپا بەرەیـەکیان لـە دژی پێکهێنـا، سـەرباری ئەمـەیش خەڵکەکـەی لەگـەڵ یـەکتر ناتـەبا بـوون، ئـەوەبوو کـاری خۆیـان دایەدەسـت نـاپلیۆن، کـە هەڵبـژاردەی خوای گەورەبوو، ئەویش لە هەموو خراپەیەك دەربازیکردن..."

لـە واقیعـدا فەڕەنسـیەکان لـە ئەسـتەمبوڵ دا هـاوڕێ و دۆسـتیان هـەبوو، کرانـەوە بەسـەر ئـەورووپاو فەڕەنسـادا جێدەسـتی ئاشـکرای خۆی لەسەر نەوەیەکی عوسمانی جێهێشتبوو. دەسـتەیەك ئەفسـەرو کـارگێڕو گـەنجی بـەئاگا لـە بیروبـاوەڕو دروشمـەکانی فەڕەنسـا هاتنـەبوون، ئـەو گەنجانـە بـە سـیفەتێك تەماشـای فەڕەنسـیەکانیان دەکرد وەك بڵێی بە ئاقارێکی باشتردا دەڕۆن، ئەوەبو بەلای ڕۆژئاوادا دایانشـکاندەوەو دەسـتیان دایـە دژایـەتیکردنی کۆنـەخوازان. ئـەم دەستە نوێیە پڕبوون لە کەف و کوڵی سادە بەرامبەر ڕۆژئاوا، ئەوانە هەستیانکردبوو ڕۆژئاوا لە ماتماتیك و ئەندازە زیاتریان هەیە[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٣٣.

پەیوەنـدیی نێـوان عوسمانییـەکان و ئەورووپیـەکان لـە مـاوەی سەدەی هەژدەهەمـدا شـوێنەواری ڕاستەوخۆو ناڕاستەخۆی لەسـەر هەندێك لە بوارەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیانەی عوسمانی، هەروەها لەسەر هەندێك لە شێوازەکانی نووسینیش جێهێشت.

هەندێ ئاڵوگۆڕمان بینی کە بەسەر بیرکردنەوەی عوسمانیدا هات لـە سـەرەتاکانی سـەدەی هەژدەهەمـدا و لـە مـاوەی حـوکمڕانی ئەحمـەدی سێیەمدا، کـە سـەردەمەکەی هـەروەها بـە "سـەردەمی تەولیب"[1] ناودەبرێت. سەرەتای بزاڤی بابەتگەرایی بە هەوڵەکانی ئیبراهیم موتەفەڕیقە دەستپێکرد، کە لە کتێبەکەیدا "بنەماکانی حوکمڕانی لـە ڕژێمـی گـەلان"دا یەکـەم هـەوڵ بـۆ لەبەرچـاوگرتنی پێشکەوتنی ئەورووپا و سوودوەرگرتن لەو پێشکەوتنانە دەبینینەوە. ئەم بزاڤە لای هەندێك لەو سیاسی و دیبلۆماتکارانەی کە ئارەزووی خۆیـان بەشـێوەیەك لـە شـێوەکان بـۆ کرانـەوە بـە ڕووی ئـەورووپادا سەلماندبوو، هێدی هێدی پتەوتربو، لەوانە ڕاغیب پاشا یان ئەحمەد ڕەسمـی یـان خـەلیل حەمیـد، کـە لـە ناوەڕاسـتەکانی سـەدەی هەژدەهەمدا ئەوەیان پیشاندا کە کاریگەریەکانی ئەورووپا جێدەستی خۆی لەسەر بیروباوەڕو زەینی خەڵك بەجێهێشتووە.

ئەمە پێش ساڵی (١٧٨٩ز) بوو، هەروەها پێش ئەوەی سەلیمی سـێیەم بچـێتە سـەر عـەرش. بـەڵام ڕاگەیانـدنی نیزامـی نـوێ و

[1] Bombaci: A: Histoire de la literature torque. Paris 1968. P. 321

داخوازییەکانی، بواری فراوانتری لە بەردەم دزەکردنی کاریگەرییە فیکرییەکانی ئەوروپاو بەشێوەیەکی تایبەتیش فەڕەنسا کردەوە.

ئەو بوارانەی کاریگەرێتیان بەرکەوت دۆخیان چۆن بوو؟

**لە نەریتەوە بۆ هاوچەرخبوون:**

کاریگەریە فیکریەکانی ئەوروپا هاتنەنێو دۆخێکی ڕۆشنبیریی خاوەن چەندین خەسڵەتی تایبەت. بەدیوێکدا ڕۆشنبیریی ئیسلامی لای عوسمانییەکان ڕەگداکوتاوو چەسپیوو فرە سەرچاوە دیاربوو، لەگەڵ ئەوەشدا دۆخی ڕۆشنبیریی عوسمانیی بە دۆگمایی و توانای سنووردار بۆ نوێبوونەوە ناسرابوو. ژیاری عوسمانی بەوە ڕەسفکراوە، مۆرکێکی سەربازی هەیە، زیاتر لەوەی ژیارێکی خاوەن فیکرو تێڕامان بێت. پێدەچێت ئەم وەسفە لەجێی خۆیدا بێت، لە بارێکدا ئەگەر بەراورد لە نێوان بەخششی سنوورداری تورکی-عوسمانی و لە نێوان بەربلاوی کولتوری ئیسلامیی سونەتیدا بکەین.

دوای ئەوەی عەشیرەتە تورکمانەکان لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی زاینیدا بوون بە موسڵمان، ئیدی هاتنە نێو بازنەی ڕۆشنبیری و کەلتوری ئیسلامی-عەرەبیەوە کە خاوەن خەسڵەتێکی سەراپاگیربو و ڕەچەڵەککەلێکی ئەتنیی جیاواز لە عەرەب و فارس و تورك و ئاسیایی و ئەفریقایی پاڵپشتی بوون. ئەم گروهانە بەشداریان لە پێکهێنانی شوناسێکی ڕۆشنبیریی یەکگرتودا کرد، وێڕای بەرفراوانبوونیشی پرانسیپی ئیسلام بەسەریدا بالادەستبو و زمانی عەرەبیشیان وەك ئامرازی گوزارشتێکی یەکگرتوو بەکاردەهێنا. ئەوەی ئەمڕۆ عەرەب بە کەلتوری تایبەتی خۆی دەزانێت، چەندین ڕەگەز فارس و تورك بەتایبەتی بەشداربوون لە

دروستکردنیدا، لە فارسدا تەبەری و ئیبن سینا و لە تورکیشدا غەزالی و فارابی.

ئەگەر فارس بەهۆی رەگ و ریشەی قوولّ و کەلتوری دێرزەمانەی خۆیانەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی پێش ئیسلام توانییێتیان زمانەکەی خۆیان بگێڕنەوە، ئەوا تورکەکان، کە پاش هاتنە ناو ئیسلام قەوارەیەکی سیاسی تازەگەشەکردوویان ناسی و پەیوەندیی تۆکمەی خۆیان لەگەلّ کەلتوری ئیسلامیدا هێشتەوە کە خاوەن گوزارشتێکی عەرەبی بو، دوای ئەوەش کاریگەری رۆشنبیری فارسی وەك کاریگەرییەکی ترو کەلەپورێکی تر لەگەلّ کۆمەلّێك هۆکاری تردا بوونە پێکهێنەری رۆشنبیری و زمانی تورکەکان.

سەبارەت بە عوسمانییەکانیش ئەوا توانییان نەریتی رۆشنبیریی سونەتی تورکەکان بپارێزن، هەردوو زمانی عەرەبی و فارسیش زمانی گوزارشت بوون. لە کاتێکدا زمانی تورکی کە وازی نەهێنابوو لە تێکهەلّکێشکردنی وشەو زاراوەی نوێ، وەك زمانێکی بەکارهێنانی رۆژانەش توانی مانەوەی خۆی بپارێزێت. ئەمە بەو مانایە نەبوو کە بەخششی تورکان لە ئەدەبیاتدا هیچبووە. بەتایبەت بەخششی لە شیعردا دەرکەوت، شیعری تورکی عوسمانی لە سەردەمانێکی زوودا دەرکەوت[1]، بەلاّم لە رووی زمانەوە کاریگەی فارسی بەروونی پێوەدیاربوو.

هەرچی زمانی عەرەبی بوو لای عوسمانییەکان بە تایبەت لە هەندێ بواردا، پێگەیەکی دیاری هەبوو. عەرەبی زمانێك بوو بۆ تێکرای ئەو زانستانەی پەیوەندییان بە ئاینەوە هەبوو لە (فیقە و حدیث و تەفسیر)دا. هەروەها مێژوونووسە عوسمانییەکان بە

---

[1] غرايبه: العرب والاتراك.دمشق١٩٦١،ص ص٢٤-٢٥.

عەرەبی سوودیان لە نوسراوە کۆنەکان دەبینی، لەوەش دوورتر هەندێ مێژوونوس پێیا باشتربوو ڕێگاکە کورتبکەنەوەو ڕاستەوخۆ بە زمانی عەرەبی بنووسن، لەوانە مەنجەم باشی (لە ساڵی ١٧٠٣ دا مردوە)، کە لەژێر ناونیشانی (جامع التواریخ)دا، مێژوویەکی گرنگی بەزمانی عەرەبی نووسیوە.

یەکێك لەو بوارە ئەدەبیانەی کە بەتایبەت عوسمانییەکان لێهاتوویان تیایدا پیشانداوە، نووسینی فەرهەنگە کە نیشانەی نەفەس درێژی و کەم داهێنانیش بوو. لەم جۆرە نووسینەدا زمانی عەرەبی کاریگەری خۆی هەبوو، هەندێ لەو نووسینانە بە زمانی عەرەبی پۆلێنکرابوون و دواتریش بۆ زمانی تورکی وەرگێڕدران، وەك کتێبی "الشقائق النعمانیة)ی تاش کوبرا زادە[1]. یان "کشف الظنون عن اسامی الکتب والفنون"ی حاجی خەلیفە[2]. لێرەدا چالاکی عوسمانییەکان لە بواری نووسینی پەراوێزدا جێی ئاماژەپێکردنە، وەك نووسینی ڕاڤەیەك بۆ ڕاڤەکردنێکی تر، یان نووسینی ڕاڤەیەك بۆ قەسیدەیەکی کۆن، ئەم جۆرە نووسینانە نیشانەی لاوازییەکی مەزن بوون لە داهێناندا، زۆرینەی دەقە ڕاڤەکراوەکانیش دەقی عەرەبی بوون، کە سیفەتێکی ئایینی یا فێرکاریی یان شتێکی لەو بابەتەیان هەبو، عوسمانییەکان گرنگیان بە فەلسەفە نەدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگیان بە هەندێ بواری بیرکردنەوەی سیاسی دەدا، کە پەیوەندیان بە پرسەکانی حوکمڕانی و کارگێڕی و پاشایەتییەوە هەبوو، لەم کارەدا سەرچاوەکانیان

---

[1] طاش کبری زادة: الشقائق النعمانیة فی علماء الدولة العثمانیة. دار الکتاب العربی بیروت١٩٧٥.

[2] حاجی خلیفة: کشف الظنون عن اسامی الکتب و الفنون، جزءان، مکتبة المتنبی، بیروت، بدون تاریخ.

فارسی و عەرەبی بوو. ئەوەبو نووسینێکی تایبەتیان گەشەپێدا کە پەیوەندیان لەگەڵ پرسەکانی حوکمڕانی و ڕێنمایی پاشاکان و گۆشکردنیان بە هونەرەکانی پاشایەتیکردندا هەبوو. لە کاتی جیاجیای قۆناغەکانی دەوڵەتدا کتێبی ئامۆژگاریکردن دەکەوت، کە ئاڕاستەی سوڵتانەکان دەکران، کە لە ڕاستیدا بیرکردنەوەو دیدگایەکی تیژو قووڵیان تیا بەدی دەکرا[١]. لقێکی ئەم ئەدەبە تایبەتبو بە نووسینی ڕاپۆرتەکان، لەوانە ئەو نامانەی بۆ پرسەکانی پاشەکشێ و داتەپین لە ماوەی هەردوو سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم دا دەنووسران.

هەرچی زانستە عوسمانییەکان بوو، ئەوا پشتیان بەو بنەمایانە بەستبوو، کە موسڵمانی ڕۆژگارە زێڕینەکان جێیانهێشتبوو، لە نێو عوسمانییەکاندا هەندێك ناو دەرکەوتن شتگەلێکی کەمیان لە بواری جوگرافیادا پێشکەشکردوە وەك نموونەیەك باوکە تۆدرینی Todrini[٢] وەسفێکی دۆخی ئەدەبیات و زانستەکان لە ئەستەمبوڵ دا دەکات لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا، لەو میانەشدا ئاماژە بۆ شاعیرو بیرمەندو زانا عوسمانییەکان دەکات، لەبەر ئەوەی پێویستبوو سەبارەت بەدۆخی ئەدەبیات ڕاپۆرتێکی هەمەلایەن پێشکەشبکات، زانیاری درێژو تێرو تەسەلی ئاماژەپێداوە. ئەوەشی تێبینیکردووە کتێبخانەکان چەندین کتێبی (عەرەبی و فارسی)یان لە بوارە جۆراجۆرەکاندا لەخۆگرتبوو. لەسەر حەقبوو کاتێك ئیبن سیناو خەوارزمی و ڕازی و ئەوانیتری وەك پێشینانی عوسمانییەکانی ئەمڕۆ دانابوو.

[١] جب و بوون المجتمع الاسلامي والغرب، ج١ ص٤٥.

[2] Todirini. De la literature des turcs. Premiere Partie

سەبارەت بەزمانی تورکی دەبینین لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمدا هەندێ پەرەسەندنی بەخۆوە بینیوە، نووسینە ئەدەبییە پەخشانئامێزەکان ڕوویان لە جۆرێك لە سادەکردنەوە کرد[1]. شیعریش لە هەمان قۆناغدا لەژێر کارتێکردنی ئاڕاستەی فەرمیدا لە سەردەمی ئەحمەدی سێیەم و وەزیرەکەی ئیبراهیم داماد جۆرێك لە گەشەکردنی بەخۆوەدیت، ئەمەی دواییان داوای وەرگێڕانی چەندین کتێبی کردووە بۆ زمانی تورکی، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین دەستەو گرووپی پێکهێناوە[2].

ئەوە تایبەتمەندییە گشتیەکانی ئەدەبیاتی عوسمانی بوو، شتێکی سروشتی بوو کاریگەرییە نوێکانی ئەورووپا لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم دا لەگەڵ شێوازە باوو ناسراوەکانی نووسینی عوسمانیدا ئاوێتەبن. ئەوەبوو بیروباوەڕی نوێ تێکەڵ بە ناوەڕۆکە سونەتیەکان بوون و فۆرمەکانیش کەوتنەژێر کارتێکردنی شێوازە نوێکانەوە.

هەروەها عوسمانییەکان ئاشنایەتیان لەگەڵ زمانێکی نوێی جیهانیدا پەیداکرد، کە لە هێنانە ناوەوەی چەمکە نوێکاندا کە پێشتر بەکارنەهێنرابوون، ڕۆڵی خۆیان هەبوو. ئەم کاریگەرێتیانە لەگەڵ خۆیاندا نوێگەرییان بۆ بیرکردنەوەی عوسمانی هەڵگرتبوو، لە کاتێکدا ئەو نووسین و ڕاپۆرتانەی کە لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا دەرکەوتن دەستپێشخەری ڕۆشنگەراکانی بۆ بزافی ریفۆرم و بانگەشەکەرانی نیشاندەدا. ڕاپۆرتی باڵوێزەکان "سفارتنامە" بەشدارییان لە ناساندنی ژیانی مەدەنی و کۆمەڵایەتی نێو

---

[1] بڕوانە لێکۆڵینەوەیەکی گشتی سەبارەت بە ئەدەبی تورکی ئیسلامی، المصری، حسین: تاریخ الادب الترکي، القاهرة ١٩٥١.

[2] koprulu. M. F: art la literature torque Islamique. Ei1, Vol. 4 P. 1004

پایتەختەکانی ئەوروپا بە عوسمانییەکان کردووە. لە کاتێکدا نامەی گەورە پیاوانی کارگێڕیی چەند لایەنێکی بیرکردنەوەی سیاسیی ئەوروپییان، ئەوەی کە لەم ڕووەوە بیروڕای بیرمەندە ئەوروپییەکانی پیشاندەدا، دەگواستەوە هەروەها نووسینە مێژووییەکان لە ناساندنی جیهانێکی نوێ و هاوچەرخدا بەشی خۆیان بەشداریانکرد.

## کتێبی گەشتنامە:

گەشتنامە لە چوارچێوەی ئەدەبیاتی ئیسلامیدا لە چاخەکانی ناوەڕاست ئەدەبێکی تایبەت بوو. ئەم ئەدەبە وەك سەرچاوەیەك بۆ حیکایەت و جوگرافیاو هەروەها ناسینی داب و نەریتی گەلان و مێژووو ڕۆڵی خۆی گێڕاوە. ئەو بازنەی گەشتەکانی تیا ئەنجام ئەدران جیهانی پان و بەرینی ئیسلامی بوو بە هەرێمە جۆراوجۆرەکانییەوە. زۆرجار گەشتەوەرەکان دوای گەیشتنیان بە شاری مەککە گەشتەکانیان کۆتاییپێدەهێنا، ئەو ئەرکە ئایینییەی خراوەتە ئەستۆی کەسی موسڵمان بۆ حەجکردن بۆ مەککە بەلایەن کەمەوە ئەگەر تەنها جارێکیش بووە لە ژیاندا، هۆکارێك بوو بۆ هاندانی دروستبوونی ئەدەبێکی تایبەت بە گەشتکردن.

بەڵام ئەوروپا، کە نەکەوتبووە سەر ئەو هێڵە ئیمانییەی دەڕۆیشتەوە سەر مەککە یا ئەو هێڵە بازرگانییەی کە دەڕۆیشتەوە سەر ڕۆژهەلات، موسڵمانەکان کەمیان لەبارەوە دەزانی، پرۆسەی پەیوەندی لەگەڵ ئەوروپا تا سەدەی حەڤدەهەم و کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمیش چڕنەبووەوە. یەکەمین گەشتی گرنگ و کاریگەر، کە تورکێك بۆ پایتەختێکی ئەوروپی ئەنجامیدابێت،

گەشتەکەی کارا محەمەد پاشا[1] بوو بۆ ڤیەننا لەساڵی (١٦٦٤ز)دا، ناوبراو لە گەشتەکەیدا تەنیا نەبوو، بەڵکو شاندێك، کە پێکهاتبوو لە سەدو پەنجا کەس، یاوەری بوون، ئەمەش ئەو هەلەی ڕەخساند تا دەستەیەکی فراوان لە پیاوانی حوکمڕان و کارگێڕ لە نزیکەوە ژیان و گوزەران لە پایتەختێکی ئەوروپیدا ببینن، ڕاپۆرتەکەشی کە وەسفی ڤیەننای تیاکردووە بەیەکەم کار دادەنرێت پێشکەش بە بابیعالی کرابێت و تیایدا وەسفی ژیانی لە ئەوروپا لەخۆگرتبێت.

بەڵام ئەو گەشتە گرنگەی کە بوو بە نموونە بۆ نووسینی ڕاپۆرتە گەشت بۆ پایتەختێکی ئەوروپی، گەشتەکەی موحەممەد ئەفەندی بوو لە ساڵی (١٧٢٠ز)دا بۆ پاریس، کە دواتر لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا لە ڕووی شێوازو فۆرمەوە بوو بە ڕێبازێك بۆ نووسینی گەشتنامە[2].

لەڕووی فۆرمەوە گەشتیان دەکردە سێ بەشەوە: بەشی یەکەمی تەرخان دەکرا بۆ ڕۆیشتنی باڵوێزو گواستنەوەی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، یان لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی تر تا دەگەیشتە پایتەختی مەبەست. لەم بەشەدا وەسفەکە پەیوەندی بەو ڕێکەوت و ناهەمواری و ناڕەحەتیانەوە هەبوو، کە لە ڕێگەدا توشی باڵوێزو شاندەکەی دەهاتن. دووەمیشیان، کە بەشێکی درێژترو گرنگتربوو، تایبەت بو بەو ئەرکەی خرابووە ئەستۆی باڵوێزو چاوپێکەوتنی پاشاو وەسفکردنی ئاوەدانی و داب و نەریت و مۆراڵی ئەو گەلەی سەردانی کردووە. بەشی سێیەم، کە وەك بەشەکانی تر گرنگ و تێرو تەسەل نەبوو، باسی لە ڕێگەکانی گەڕانەوەو گەشتنەوە بە ئەستەمبوڵی دەرگای سەعادەت دەکرد.

---

[1] SHAW. S. J: Betuween old and new.. P. 185

[2] بڕوانە بەشی سێیەم.

بێگومان بەشی دووەم پێگەیەکی گرنگی لە ڕاپۆرتەکەی سەفیردا هەبوو. زۆرجار تێرو تەسەلی لە وەسفداو شۆڕبوونەوە بۆ نێو وردەکاریەکان دەبوونە مایەی دەوڵەمەنکردنی زانیارییەکان دەربارەی دۆخی ژیان لە پایتەختەکانی ئەوروپادا. وەسفیش لە دوو خاڵەوە سەرچاوەی دەگرت: لە پیشاندانی جیاوازی لە نێوان نەریتی گەلانی ئەوروپی و نەریتی عوسمانییەکاندا، خاڵەکەی تریش لە بڕوای پێشوەختەوە بە پێشکەوتنی ئەورووپا لە بوارەکانی ئاوەدانی و هونەر و زانست و پیشەسازیدا. ئیدی نووسەر وەسفێکی تێرو تەسەلی بۆ ڕواڵەت و دەرکەوتەکانی هەر لایەنێکی ئەم پێشکەوتنە دەکرد کە چاوی پێدەکەوت.

سەدەی هەژدەهەم زیادبوونێکی بەرچاوی لە ژمارەی ئەو باڵوێزە عوسمانیانەدا بەخۆوەبینی، کە ڕەوانەی پایتەختەکانی ئەوروپا دەکران. پاش موحەمەد ئەفەندی کوڕەکەی سەعید ئەفەندی لە ساڵی (١٧٤١ز)دا سەردانی پاریسی کرد، لەبەر ئەوەی پێشتر لە گەشتەکەی ساڵی (١٧٢٠ز)دا یاوەری باوکی کردبوو، سەردانی هاوڕێ دێرینەکانی لە بنەماڵەی کاسینی لە بنکە فەلەکەوانیەکەی پاریس دا کردووە. سەعید ئەفەندی شارەزای لە زمانی فەرەنسیدا هەبوو، لە ڕاپۆرتەکەیدا باس لەوەدەکات سەردانی فرانسیزی کۆمیدی کردووە و شانۆگەرییەکەی ڤۆڵتێری لەسەر موحەمەدی پێغەمبەر دیتووە[1].

گەشتەکەی موحەمەد دەرویش ئەفەندی بۆ پیترسبۆرگ لە هەمان بازنەدا هاتووە، بۆ داڕشتنەوەی گەشتەکەشی هەمان ڕێبازی پەیڕەوکراوی بۆ نووسینی گەشتنامە گرتۆتەبەر. گەشتەکەی

---

[1] Berkes, N: The Devlopement..P. 51

موحەممەد دەرویش ئەفەندی[1] لە سەرەتای سەردەمی سوڵتان عوسمانی سێیەمدا لە ساڵی (١٧٥٤ز) ئەنجامدراوە دەتوانین وا گەشتەکەی هەڵبسەنگێنین کە دوو ئامانجی لەپشت بووە: ئاگادارکردنەوەی خانمە ئیمپراتۆر بەچوونە سەر تەختی سوڵتانێکی نوێو هەوڵدان بۆ باشترکردنی پەیوەندیەکان لەگەڵ ڕووسیا. بەڵام لە ڕاپۆرتەکەیدا باس لەم مەسەلانە ناکات، بەڵکو تەنها بینینەکانی بە تێرو تەسەلی باسکردووە. دەتوانین سەرنجەکانی لە سێ مەسەلەدا کورتبکەینەوە: ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانی و پێشکەوتنی سەربازی.

سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاوە، ئازادی تێکەڵبوون لە نێوان ژنان و پیاوانداو ئاهەنگەکانی سەما، کە لە کۆشکی خانمی ئیمپراتۆردا سازدەدران. سەبارەت بە ئاوەدانیش بۆ وێنە ئەوەی تێبینیکردووە کە: "ئەو شوێنەی پیترسبۆرگی لەسەر بوونیادنراوە پێشتر دارستان و ئاو بووە.. پیتەری سێزار گۆشەنیگای وابو شوێنەکەی زۆر گونجاوە ئەوەبوو شارەکەی لەسەر بوونیادنا، دارستانەکان نەمان و زۆنگاوەکانیش وشکرانەوە ماڵیان لە تەنیشت ڕووبارەکەدا بەرزکردەوە و بە قرمید سەریانگرت، جێگەیەکیش کە لە ڕووبارەکەوە دور نیە تەرخانکراوە بۆ بوونیادنانی کەشتی بۆ خزمەتی ئیمپراتۆر و خەڵکی بەگشتی. بەو هۆیەوە کە ڕووباری نێڤا (Neva) دەچێتەوە سەر دەریای بەڵتیک، ئەوا هەرگیز دیمەنی هاتنی کەشتی وڵاتانی دراوسێی لێنەدەبڕا"[2] هەرچی بواری سەربازیشە، ئەوا لە وەسفکردنی جبەخانەکاندا دەردەکەوێت:

---

[1] -Relation de L"ambassade du Dervich Mehemed Efendi a petersbourg. Extradite des annals de L"empire ottoman. Journal Asiatique, VIII(1826) PP.118-125.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٢٢.

" لە ڕۆژی دواتردا باڵوێز سەردانی جبەخانەکەی کرد، بیست و پێنج کەشتی بینی، باڵوێز لەو کەسانەی پرسی کە دەوریاندابو، ئەم کەشتیانە لە کوێ بەکاردەهێنرێن ؟ وتیان: یەکەم جار لە دەریای بەلتیك، لەوێشەوە ڕێگەی زەریا دەگرنەبەر بۆ مەشقپێکردنی سوپاکەمان لەسەر هونەری دەریاوانی "[1].

ڕاپۆرتەکەی موحەمەد دەرویش ئەفەندی، کە جارێکی تر لە ساڵی (١٧٦٤ز)دا دا سەردانی پیترسبۆرگ دەکاتەوە، وێنەیەکی سەبارەت بە نوێکردنەوەی ڕووسیا لە سەردەمی کاترینی دووەم و ئەو پێشکەوتنەی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم دا پێیگەیشتوون، پێشکەشکردووە.

گەشتەکان بۆ پایتەختەکانی ئەورووپا یەك لە دوای یەك دەستیانپێکرد، موستەفای سێیەم لە ساڵی (١٧٥٧ز)دا شەهدی عوسمان ئەفەندی بۆ لای خانمە ئیمپراتۆری ڕووسیا ڕەوانەکرد، بۆ ئاگادارکردنەوەی لە چونی سوڵتانێکی نوێ بۆ سەر عەرشی عوسمانی. لە هەمان ساڵداو بۆ هەمان مەبەست، ئەحمەد ڕەسمی[2] جەمیل ئەفەندی (١٧٠٠-١٧٨٣ز) هەنارد بۆ ڤیەننا، کە دوای گەڕانەوەی بە ناونیشانی "ویانە سفارتنامە سی" ڕاپۆرتێکی نووسی. ئەمیش تێبینیەکانی سەبارەت بە پایتەختێکی تری ئەورووپا نووسیوەتەوەو دەڵێت: "پایەدار و ساماندارەکان تا سەعات هەشت یان دەی سەر لە بەیانی لەخەو هەڵناسن، بۆ نزیك نیوەڕۆ بەرچای دەخۆن. دوای نیوەڕۆ جارێکی تر خوارد دەخۆن، و بە گالیسکەکانیان هەندێك دەسوڕێنەوە و پاشان ئامادەی ئاهەنگێك یان ئۆپێرایەك دەبن، لەوێشەوە دەڕۆن بۆ بەشداریکردن لە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

[2] Babinger. F. art. Ahmed Rasmi Ei2, Vol. 1, P. 304.

کۆبوونەوەیەك و بە خواردنی شیوی ئێوارەش ڕۆژەکەیان کۆتاییپێدەهێنن..."[1].

هەروەها دوای ئەوەی سولتان عەبدولحەمید لە سالی (١٧٧٤ن)دا، چووە سەر عەرش، ئەحمەد ڕەسمی بە سیفەتی وەزیر سەردانی بەرلین-ی کرد. ڕاپۆرتێکی تری لەسەر ئەم گەشتەی نووسیوە، تیایدا وردەکاری زۆری ئامارەپێکردووە. ئەم ڕاپۆرتەی هەر زوو سەرنجەکان بۆ خۆیان ڕادەکێشن، تەنانەت لە ڕۆژئاواشدا، هەلبەتە بەهۆی بیروڕاکانییەوە سەبارەت بە پۆلیسی پروسیاو وەسفکردنی بۆ بەرلین و دانیشتوانەکەی و بەهۆی هەموو تێبینیە وردەکانی ترییەوە.

لێرەدا دەتوانین ئەوە بلێین کە ئەحمەد ڕەسمی کتێبێکی گرنگی بە ناونیشانی (خلاصة الاعتبار) نووسیوە[2]، تیایدا باسی لە جەنگی ڕووسی لە بەلقاندا کردووە. لەم کتێبەدا کە لەوە زیاترە بە تەنها گێڕانەوەیەك بێت بۆ ڕوداوەکان، ناوبراو هەوڵ ئەدات هۆکارەکانی هەلکشانی ڕووس بۆ سەر شانۆی مێژوو و لە هەمان کاتدا پاشەکشێی هێزی عوسمانی و ونبوونی ئامادەگیان ڕاڤەبکات.

ئەحمەد ڕەسمی لە کتێبەکەیدا، کە جۆرێکە لە ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی مێژوویی، ڕەخنە لە نەزانین و لوتبەرزی کۆنەپارێزە عوسمانییەکان دەگرێت و بە بەرپرسی هەلگیرسانی جەنگ و دۆڕانیشیان دەزانێت. ناوبراو یەکەم کەسە ڕەخنە لەو ئەفسانەی عوسمانییە بگرێت، کە دەلێت: تورکەکان دانراون بۆ ڕبەمەسیحییەکان بدەن، ئیدی بەچاوپۆشین لە ژمارەو هێزو توانایان.

---

[1] هامەری Hammerی مێژوونووس لە مێژووەکەیدا ب١٦، ص٢٧-٢٨ ئامارەی بۆ دەقەکە کردووە.

[2] دەستنووسێك لە کتیبخانەی نیشتمانی لە پاریس، ژمارە ١١٨٠.

ئەو ئاکامانەشی پێیگەیشتووە، بوار دەدەن لە دەرەوەی هەژمونی ئایینیدا بەدوای بەهای نوێدا بگەڕێن، کە دەبنە هۆی تێگەیشتنی عەقلانیانەتر لە ڕوداوەکان. هێمای بۆ ئەوەش کردووە، کە هێزی عوسمانی ئاوابووە، ناشتوانێت ڕوبەڕوی ڕووسیا ببێتەوە، کە خاوەن سامانێکی مادی مەزنەو لە بواری سەربازیدا پێشکەوتووە. لە کۆتاییدا دەڵێت پەیڕەویکردنی سیاسەتی ئاشتەوایی و لێبوردەیی بەرامبەر نەتەوە نا موسڵمانەکان کارێکی پێویستە، بڕواشی وابوو دەبێت هەڵاوێردە سیاسیەکان دور لە کەف و کوڵی ئایینی ئەنجام بدرێن، لێرەدا داوادەکات هەمان ئەو ڕێبازانە بگیرێتەبەر کە وڵاتە ناموسڵمانەکان پیادەی دەکەن[1].

لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونانەدا کە ئەحمەد ڕەسمی لە ڕاپۆرتەکانیدا ئاشکرایکردوون، ڕادەی کاریگەریەکانی پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوروپا بۆ ئاشکرادەبێت، کە لە میانەی گەشت و پەیوەندیە ڕاستەوخۆکانەوە ڕوویانداوە. ئەمەش ڕادەو سنووری نەترسیی و چاوقایمی بۆچوونی ڕۆشنگەرە عوسمانییەکانمان بۆ دەخاتەڕوو.

لە چوارچێوەی گەشت و پەیوەندیەکاندا لەگەڵ پایتەختەکانی ئەوروپا، بایەخ و گرنگی ئەزمونەکەی سوڵتان سەلیمی سێیەممان بۆ دەردەکەوێت، کە خۆی لە هەناردنی نێردراوی بەردەوامدا بۆ پایتەختەکانی ئەوروپا دەبینیەوە ناوبراو باڵوێزەکانی خۆی ڕەوانەی هەر یەك لە لەندەن و پاریس و ڤیەنناو بەرلین و پیترسبۆرگ کردووە.

[1] Berkes. N: The Development. PP. 57-58.

یەکەم باڵوێزەکانی سەلیمی سێیەم بۆ لەندەن، یوسف ئاغا [1] بوو، کە لە ساڵی (١٧٩٣ن)دا گەیشتۆتە ئەو شارە، دوای ئەوەش مەحمود ڕەئیف[2] لە نێوان ساڵانی (١٧٩٥ و ١٧٩٧ن)دا پۆستی سکرتێری باڵوێزخانەی وەرگرتووە. هەروەها سوڵتان لە ساڵی (١٧٩٦ن)دا مورلی عەلی ئەفەندی[3] ناردووە بۆ پاریس، ئەوەبوو تا ساڵی (١٨٠٢ن) لە پۆستەکەی ماوەتەوە دوای ئەویش لە نێوان ساڵی (١٨٠٢ و ١٨٠٥ن)دا خالید ئەفەندی[4]. پاشان لە نێوان ساڵانی (١٨٠٦ بۆ ١٨١١ن)دا، موحیب ئەفەندی و وەحید ئەفەندی[5]. بەڵام بۆ ڤیەننا ئەوا سوڵتان لە ساڵی (١٧٩٢ن)دا، ڕاتب ئەفەندی هەناردووە، دوای ئەویش لە نێوان ساڵی (١٧٩٧ بۆ ١٨٠٠ن)دا، ئیبراهیم عەفیف ئەفەندی. لە بەرلین_ یشدا ئەحمەد ئەفەندی لە نێوان ساڵانی (١٧٩٠ بۆ ١٧٩٤ن) ماوەتەوە، عەلی عەزیز ئەفەندیش لەنێوان ساڵانی (١٧٩٧ بۆ ١٧٩٨ن)دا، پۆستی تەنها باڵوێزەکەی پترسبۆرگیش لە ساڵی (١٧٩٢ن)دا، پاش کۆتایی جەنگ و بەستنی پەیماننامەی "ژاسی" موستەفا ڕەشید پاشا پڕیکردبۆوە کە ماوەیەکی کورت لە پۆستەکەیدا مایەوە[6].

---

1 Hammer, J. V: Account of the mission of Yusuf Agha, ambasadeur from turkey to the british Court. T. R. A. S. VIII(1833). PP.496-505

2 Rail, M: Journal de Voyage de Mahmoud Rail en Angleteree, ecrit par lui-meme. Topkapi Istanbul, Ahmed III Collection, MS. No 3707.

٣ دەربارەی چوونی مۆرلی عەلی ئەفەندی بۆ پاریس بڕوانە:

Hrbberte, M; Un ambassade turquesous le directoire, Paris 1902.

٤ بڕوانە وەرگێڕدراوی فەرەنسی ڕاپۆرتەکەی موحیب ئەفەندی لە چوارچێوەی:

Bareilles, B: Un turc a Paris. Bossard 1920.

٥ ڕاپۆرتی وەحید ئەفەندی لە کتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس، ژمارە ٥٠٧.

٦ پێشاندانێکی خێرای ئەم باڵوێز و گەشتانە لەم سەرچاوەدا ببینە:

- SHAW. S. J: Between old and new..PP.187-193.

زۆرینەی ئەم باڵوێزانە ڕاپۆرتیان سەبارەت بە گەشتەکانیان بۆ ئەو پایتەختانەی هێمایان بۆ کراوە نووسیوە، دیارترینیان ڕاپۆرتەکەی هەردوو باڵوێز موحیب ئەفەندی و وەحید ئەفەندی بوو لە پاریس.

موحیب ئەفەندی پێنج ساڵ لە پاریس ماوەتەوە[1]، لە ساڵی (١٨٠٦ز)دا نێردراوە بۆ لای ناپلیۆن بۆ ئەوەی پیرۆزبایی پێشکەشبکات، ناوبراو هەمان نەریتی نێردراوەکانی پێش خۆی، ڕوداوەکانی مانەوە درێژخایەنەکەی تۆمارکردووە، لە سەرەتای ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: "وەك لاسایکردنەوەی باڵوێزە نێردراوەکانی پێشوتر لە وڵاتی کافراندا، ساکیز چەلەبی (محەمەد ئەفەندی) کە لە ساڵی (١١٣٢ك/١٧٢٠ز) ناردویانە بۆ پاریس، کردۆتە نموونەی خۆم، سەبارەت بە مانەوەی خۆم لەم وڵاتە ڕاپۆرتێکم نووسیوە". لەو سونگەوە کە لە نووسینی "سفارتنامە"کەیدا هەمان ڕێبازی موحەمەد ئەفەندی پەیڕەوکردووە، ئەوا وەسفێکی تێرو تەسەلی بۆ کارگە و مانیفاکتۆرە و قوتابخانەو کتێبخانە گشتییەکان، هەروەها بۆ دام و دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش و دادپەروەری و گەشەکردنە بەرچاوەکانی فەڕەنسا کردووە.

یەکەم شتێك وەسفیدەکات پاریسی دێرینە، کە تیایدا تێبینی ئەمن و ئاسایشی کردووە کە چۆن خێرا سەرپێچیکەران و تاوانباران دەستگیر دەکرێن، پاشان دەچێتە سەر باسی دادپەروەری و مافی تاکەکان‌و سەرنجی ئەوەدەدات، کە یاسا هەمووان وەك یەك دەگرێتەوە لە دۆخێکدا ئەگەر تاوانەکەی بەسەردا سەلمێنرا، ئیدی هەر کەسێك بێت و پلە و بنەماڵەکەی چی بێت. ئەمن و ئاسایش

---

[1] لێرەدا وەرگێرانی Bareillesی ئاماژەبۆکراومان بەکارهێناوە.

سەرچاوەی گەشەکردنن، پاراستنی ئازادی و سەربەستی تاکەکان دەستیان والأدەکات بۆ کارکردن و گەشەپێکردنی شار دەڵێت:"لە دەشتاییەکانی فەڕەنسادا شارگەلێکی زۆر هەن، مرۆڤ دوو سەعات ناڕوات ڕێکەوتی شارێک یان گوندێك دەکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تێکڕای چالاکی دانیشتوان بۆ کارکردن ئاراستەکراوە، ئەمن و ئاسایش فەڕەنسای کردۆتە وڵاتێکی گەشاوە کە توانای خۆبژێوی هەیە". هەروەها هێما بۆ یەکسانی لە مامەڵەکردنی هاولأتیاندا لە نێوان تێکڕای دەستەو تاقمەکاندا کردووە.

بەدیوێکی تریشدا موحیب ئەفەندی چەندین لاپەڕەی لە ڕاپۆرتەکەی بۆ قسەکردن لەسەر ژیانی کۆمەلأیەتی لە فەڕەنسادا تەرخانکردووە، لەم بارەوە دەڵێت:"پیاوان و ژنانی مەسیحیی لە ڕابواردندا تەواوی ئازادی، ئازادن". باسی فرانسیزی کۆمیدی و کۆشکی پاشایەتی دەکات، هەروەها سەردانی ئەو ڕوانگەیەی کردووە کە محەمەد ئەفەندی پێشتر سەردان و ئاماژەی بۆ کردووە. هەروەها سەردانی کتێبخانەی نیشتمانی کردووە و ئەمانەی تیادا بینیوە: "کتێبی زۆر کە هەژمارناکرێن لەسەر ڕەفەکان بەجوانی سەفتە کراون. لەوانە کتێبی مێژوو و زانست و شیعرو ئەدەب". هەروەها سەردانی نەخۆشخانەو قوتابخانەکانی کردووە. شتێکی سرووشتی بوو لە ڕۆژگاری ناپلیۆن پۆناپەرتدا سەرسام بێت بە هێزی سەربازیی فەڕەنسیی، دەڵێت: " گەل هەموو ساڵێك هەشتا هەزار پیاوی پێشکەش دەکەن... پاش هەشت یان ده ساڵ لە ڕاژەکردن، ئەم سەربازە ڕەوانەی ماڵەوە دەکرێتەوە ئەگەر بریندار نەبێت، ئەوا لە کۆشکێکی گەورەدا پێشوازی لێدەکرێت و لە دوا ڕۆژگارەکانی ژیانی خزمەت دەکرێت".

بالویزێکی ترک له سهردهمی سهلیمی سێیهمدا سهردانی پاریسی کردووه و راپۆرتێکی درێژی سهبارهت به گهشتهکهی نووسیوه "سهید وهحید ئهفهندي" یه[1]، سهردانهکهی بۆ پاریس و شارهکانی تری فهرهنسا و ئهورووپا، که له سهرهتای سالی (۱۸۰۷ز)دا دهستیپێکردووه، نزیکهی سالێکی خایاندووه. مهبهستی ئهم سهردانه دیاربو، چاوپێکهوتنی ئیمپراتۆرو گفتوگۆکردن بوو لهگهڵیدا سهبارهت به ههندێ مهسهلهی سیاسی. بهڵام مهبهستهکه جێبهجێ نهبو، چونکه لهو ماوهدا ئهو له فهرهنسا بو سوڵتانیان لهسهر تهخت لادا، ناچار گهڕاوهتهوه ئهستهمبوڵ، له کۆتایی راپۆرتهکهشیدا نووسیویێتی " له دهستکهوتهکاندا به گهرانهوه قایلبوم". بهههرحاڵ ئهو راپۆرتهی که سهفیر نوسیویێتی، بهڵگهیهکی تره لهسهر کاریگهری گهشتهکان له سهر ناساندنی ولاتانی ئهورووپا. بهو هۆیهوه که سهید وهحید ئهفهندی لهگهشتهکهیدا رێگهی خاکیی گرتۆتهبهر، بۆیه توانیویێتی دهرکهوتهکانی پێشکهوتن له زۆرێك له شارهکانی ولاته جیاوازهکانی ئهورووپا تێبینیبکات.

لهرێگهیهکی خاکیهوه چووهته بهلگرادو له شارهکهدا ماوهتهوه، وهسفێکی قهلاکهی و تێپهڕبوونی ڕووباری دانوب دهکات به ناویدا، ههروهها باسی له بواری زانستیی شارهکه کردووه، پاشان له ڤیهننا ماوهتهوه، ئهوهی لهم شارهدا سهرنجی راکێشاوه: کتێبخانهکهیهتی که چهندین نووسینی ئیسلامی تێدابووه ههروهها باسی نهخۆشخانهکهی (تشريح خانه) کردووه که تابلۆیهکی تیادابووه له وێنهی مرۆڤ و چهندین نهخۆشی جیاجیای لهسهر ڕوونکراوهتهوه.

---

[1] سيد وحيد افندي: فرانسه سفارتنامه سي، مخطوط المكتبة الوطنية، باريس.

نـاوی ئەندامـەکان و دەمارەکـان لەسـەر وێنەکـە دەستنیشـانکراوە. ناوبراو لەسەر گەشتەکەی بەردەوام دەبێت و لەو نێوانەشدا درێژەی بەوەسفکردنی سروشتی شارەکان داوە، لەوانە وەسفکردنی شاری وارشاویا (فەرسۆفیا) و ڕوباری ڤستۆل و لیتوانیا، لەو میانەشدا باس لە پروسیاو پرنسیپەکانی کۆماری دەکات، زانستەکانی ماتماتیک و هونەرەکانی جەنگ سەرنجی ڕاکێشاون، ئامارەی بۆ ژمارەی سەربازەکانی پروسیا کردووە. بەهەمان شێوە بۆ بەرپرسەکانی ئەم ولاتە، کە چۆن بۆ زانینی داهات و خەرجی دەولەت وردبینی ئەنجامدەدەن. تێپەڕبوونی کەشتییەکان بەرووبارەکانداو لە میانەی بەربەستە دەستکردەکانەوە یەکێکی ترە لەو شتانەی سەرنجیان ڕاکێشاوەو پێی سەرسام بووە.

پاش ئەوەی گەیشتە فەرەنسا، پێش چاوپێکەوتنی لەگەل ئیمپراتۆردا، وەك سەرەتایەك تالیرانی بینیوە، پاشان لە کۆشکەکەیدا چاوی بە خودی بۆناپەرت کەوتووە کە بەوەرگێڕ و مارشال و ژەنەڕال و تێکڕای ئەفسەرەکانی تر دەورردرابوو. بەشێکی ڕاپۆرتەکەی بۆ نیشاندانی ژیانی بۆناپەرت تەرخانکردووە، هەر لەدایکبوونیەوە تا گەیشتنی بە پاریس، و ڕۆلی لە (نائارامیەکاندا) واتا لە شۆڕش دا، چۆن (فەرەنسا جمهوری) واتا کۆماری فەرەنسا بە ئەرکێك ڕەوانەیان کردووە بۆ ئیتالیا، لەوێ ڕۆماو ناپۆلی داگیرکردووە، ئامارەش بۆ ئەوە دەکات، کە دەستکەوتەکانی لەو ولاتەدا گەورە فاتیحەکانی مێژوو دێنێتەوە یاد[1].

---

[1] لە کاتی قسەکردندا سەبارەت بە ناپلیۆن سید وحید افندی داگیرکردنی ناپلیۆن بۆ میسر پشتگوێ دەخات.

لەگەڵ باڵوێزەکانی سەلیمی سێیەمدا ئەوروپا لەوە دەرچوو خاکێك بێت بۆ دۆزینەوە، ئەوروپا لای ئەوان و ژمارەیەکی زۆر لە تورکانی عوسمانی خاکێکی ناسراوبوو، ئیدی تورکێك کە لەسەر قاچەکانی ڕاوەستابوو، ئەوروپیەك نەبوو، کە لەسەر سەر وەستابێت، وەك ئەوەی موحەممەد ئەفەندی لە جیاوازی نێوان تورکێك و ئەوروپیەکدا لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا ئاماژەی بۆکردووە.

## ڕاپۆرت و نامەکان

ڕاپۆرتی باڵوێزەکان وێنەیەکی واقیعیان لەسەر پایتەختەکانی ئەوروپاو شارەکانی هەروەها سروشتەکەی پێشکەشکرد، بە جۆرێك پێش ئەوەی سەدەی هەژدەهەم تەواوبێت، وێنەکە بەتەواوی کاملبوو، بە جۆرێك تورکە عوسمانییەکان بوون بە خاوەن بیرۆکەیەکی سەراپاگیری تێرو تەسەل لەسەر دانیشتوان و دەوڵەت و حکومەتەکانی ئەوروپا، بە هەمان شێوە ژیانی زانستی و ئاوەدانی و توانا سەربازییەکانیان، سەرباری ئەو بیروباوەڕانەی پێشکەوتنی ئەوروپیەکانی کۆنترۆلکردبوو و ژیارە هاوچەرخەکەیانی پیشاندەدایەوە.

ئەگەر ڕاپۆرتی باڵوێزەکان گرنگیەکی سنوورداریان دابووە ئەو بیروباوەڕانەی لە ئەوروپادا دەرکەوتبوون، ئەوا نووسەری ڕاپۆرت و نامە چارەسەرسازیەکان لەم بیروباوەڕانە بە ئاگاتربوون، تەنها بە تێبینیکردنی دەرکەوتەکانی پێشکەوتنی ئەوروپا نەوەستان، بەڵکو هەوڵیاندا لە میانەی شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی ئەو هۆکارانەوە لە هۆکارەکان بکۆڵنەوە، لە هەمان کاتدا هەوڵیاندا ئەو توخم و ڕەگەزانە بدۆزنەوە کە هێزی پێشوتری عوسمانی دەگێڕێتەوە، لە میانەی ئەو

بڕە زانیاریانەی سەبارەت بە هۆکارەکانی پێشکەوتنی ئەورووپا وەدەستیان هێنابوو.

نووسەری ئەو نامانە سەر بەدەستەیەکی نووسەرانی عوسمانی بوون، کە ئەدەبێکی تایبەت بەخۆیان داهێنابو، ئەویش ئەو ئەدەبە بوو، کە پرس و کاروبارەکانی حوکم یان دیوانیان چارەسەردەکرد و گرنگییان بەپەروەردەکردنی میرو پاشاکان دەدا[1]. ئەم جۆرە لە نووسین لە قۆناغە جیاوازەکانی حوکمڕانی عوسمانیدا پەرەیسەندووە، بەهۆی پەیوەندی نزیکیانەوە لە سوڵتان و سەرپەرشتیکردنیان بۆ کاروبارەکانی حوکمڕانی نووسەرانی نامەو ڕاپۆرتەکان پێگەیەکی دیارو بەرچاویان هەبووە. لە سەردەمانێکی زۆر زووشەوە ئەم ئەدەبە لای عوسمانییەکان بایەخی تایبەتی پەیداکردووە، بەهۆی چارەسەرکردنی بۆ ئەو مەسەلانەی پابەندبوون بە ئایندەی دەوڵەتەوە. ئەم نووسەرانە قۆناغ دوای قۆناغ و لە میانەی گفتوگۆکردنی بەردەوامەوە لەمەڕ داتەپینی دەوڵەتی عوسمانی جۆرێکی نوێی بیرکردنەوەیان داهێنا. بینیمان چۆن قوچی بەگ و حاجی خەلیفە و حوسێن هەزارفەن و ئەوانیتر تێکڕایان لە نووسەرانی دیوان و لە خزمەتی سوڵتاندا بوون. نووسینەکانیان بەشێکی بنچینەیی ئەدەبی سیاسی پێکدەهێنا، کە گرنگی بە ئێستاو ئایندەی دەوڵەت دەدا.

لەماوەی سەدەی هەژدەهەمدا ئیبراهیم موتەفەڕیقە بە کتێبی "بناغەی حوکمڕانی لە ڕژێمی گەلاندا" و ئەحمەد ڕەسمی لە "کورتەی ئیعتیبار"دا، دەرکەوتن، ئەم نووسەرانە لە میانەی بەکارهێنانی توخم و ڕەگەزی نوێوە لە شیکردنەوەی لاوازی و داتەپینی

---

[1] جب و بوون المجتمع الاسلامی والغرب، ج١ ص٤٥.

عوسمانی و ئاوابوونی تواناکانیەوە توانیان شتی نوێ بخەنە سەر ئەم ئەدەبە سیاسییەی عوسمانی، هەڵبەتە لەبەر ڕۆشنایی دەرکەوتنی هۆکارو ئامرازی ئەوروپی و دوپاتکردنەوەی ئەوروپا بۆ تواناو هێزی خۆی، نەك تەنها لە بواری سەربازیدا، بەڵکو لە بوارەکانی زانست و ئاوەدانی و فیکریشدا. دەتوانین بڵێین کە ئاکامی هەوڵو تەقەللاکانی ئەوان دوو ڕۆڵی جیاوازی گێڕا، یەکەمیان: قبووڵکردنی واقیعی ئاوابوونی هێزو توانای عوسمانی، دووەمیشیان: زەمینە ڕەخساندن بۆ قبووڵکردنی بیروباوەڕە نوێکانی ئەوروپا[1].

ئەو پەرەسەندنە گرنگەی هاتە نێو ئەم جۆرە لە ئەدەبی سیاسی، لە سەردەمی سەلیمی سێیەمدا دەرکەوت، لە چوارچێوەی ئەنجومەنی مەشروتەدا کۆمەڵێك ڕاپۆرت پێشکەشکران، گرنگترینیان هەردوو ڕاپۆرتەکەی تاتارجیق و ئەبو بەکری ڕاتب ئەفەندی بوو، ئەگەر کاریگەریەکان بە گشتی لە ڕاپۆرتی یەکەمیاندا هەستپێدەکرا، ئەوا ڕاپۆرتی دووەم بە ئاشکرا کاریگەریی فیکری فەڕەنسییان لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا پێوەدیاربوو.

عەبدوڵڵا مەلا تاتارجیق زادە (١٧٣٠-١٧٩٧ز) لە ساڵی (١٧٩٢ز)دا نامەیەك، کە پرۆژەیەکی چارەسەرسازی لە خۆگرتبوو، پێشکەشی بە سوڵتان سەلیمی سێیەم کرد. خۆی یەکێك بوو لە ئەندامەکانی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری و لە ڕووی تەمەنیشەوە گەورەترینیان بوو، لە بنەڕەتیشدا کوڕی یەکێك لە زاناکان بوو، لە هەمان کاتدا خۆیشی لە زاناکان بوو. پێش ئەوەی سەلیمی سێیەم بچێتە سەر عەرش، چەندین پۆستی جۆراوجۆری دیبوو، لە قودس و

---

[1] بگەڕێوە بۆ بەشی دووەمی ئەم کتێبە.

قاهیرەو مەدینەدا قازی بوو[1]. لە ساڵی (١٧٨٩ن)دا پۆستی قازی عەسکەری ڕۆمللی بەدەستبووە، لە دوا ساڵەکانی تەمەنیشیدا پۆستێکی جیاوازترو دورتری لە پیشە بنەڕەتیەکەی خۆی وەرگرتووە، کرایە شارەزا لە بواری مەسەلە سەربازیەکانداو لە بەڕێوەبردنی ڕێکخستنی سوپاو نوێکردنەوەشیدا یاریدەدەرو بەشداربوو. ژیاننامەی ئەم کەسایەتیە بەهرەمەندیەکەی پیشاندەدات و بەڵگەن لەسەر بیروباوەڕی کراوەی ئەو، لەوانە بانگهێشتکردنی بۆ نوێکردنەوەی دەوڵەت وێڕای ئەوەی خۆی سەر بەزانایان بوو، ئەوانەی دژی بە هەنگاوە چارەسەرسازیەکانی سەلیمی سێیەم وەستانەوە.

ئەو نامەی کە بۆ ئەنجومەنی مەشورەتی بەرزکردەوە، چەندین پێشنیاری بۆ چاکسازیکردن لە هەردوو بواری سەربازی و مەدەنیدا تیابوو[٢]. دابەشیکردبووو بۆ دە بەش، وەك لە ناونیشانەکانیدا دیارە ئەم مەسەلانە لەخۆدەگرێت: خستنەڕووی کاروباری سوپا و ڕێکخستنی، خستنەڕووی سیستەمی زانایان و مامۆستایان و قازییەکان. خستنەڕووی سیستەمی مامەڵە و گوشارەکانی باج و ریفۆرم لە بواری دراودا. دەرخستنی سوودو کەڵکی بزاوتە چارەسەرسازیەکانی سوڵتان، پێویستی بەهێزکردنی سنوورە هەرشەلێکراوەکانی ئیسلام، ریفۆرمکردن لە بواری دەریاوانیدا و پێویستی بوونیادنانی کەشتیگەل. زیادکرنی داهاتی دەوڵەت و بەرتەسکردنەوەی خەرجیەکانی، پیشاندانی دۆخی وەزیرەکان،

---

[1] - SHAW. S. J:Between old and new. P.92

[٢] لێرەدا گەڕاینەوە بۆ دەستنووسەکەی تاتارجیق زادە لە ناونیشانی (لایجە)یە لە کتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس، ژمارە ١١٠٥.

پێویستی ڕێکخستنی جزیەو نەهێشتنی ستەم و زوڵم و زۆر لەسەر تێکڕای وڵات و عیباد.

تاتارجیق زادە چەندین باس و خواس و پێشنیاری دیاریکراوی سەبارەت بە پیشەکەی خۆی کە لە چینی عولەما یان زانایان بوو پێشکەشکردوە، ئەوەی پێشنیارکرد کە ئەندامانی زانایان دوای تاقیکردنەوەیەك هەڵبژێردرێن، ئەم هەڵبژاردنەش دەستەیەکی تایبەت ئەنجامیان بدات کە لە لایەن خودی سوڵتانەوە پێکهێنرابێت. سەبارەت بە ژمارەی پۆستەکان و سنووری موچەکانیش ئەوا پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی جاران، هەرچی پۆستی شەیخولئیسلام بوو، ئەوا دەبوو بدرێت بە کەسێکی شایستە و لێهاتوو، هەمان شت سەبارەت بە پۆستە ئایینیەکانی تر. بڕوایشی وابوو ئەوانەی پۆستەکان وەردەگرن، پێویستە کاتی پێویستیان بدرێتی کە لە نێوان پێنج بۆ ده ساڵ بێت، لەگەڵ سەربەستی تەواودا بۆ لێپێچینەوە لە ڕەوشی ئەو دام و دەزگایانەی لە ئەستۆیان گرتووە، هەروەها بۆ گەڕانەوەی نەزم و دیسپلین بۆ دەزگای زانایان و گێڕانەوەی بۆ دۆخی ئاسایی جارانی خۆی.

سەبارەت بەڕاڤەکردنی بارودۆخی دەسەڵات و هۆکاری کەنەفتبوون و داتەپینی، ئەوا دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو دۆخەی دام و دەزگاکان لە ماوەی هەردوو سەدەی ڕابوردودا بەسەریانبردووە. ناوبراو لێرەدا ڕاڤەکردنەکەی قوچی بەگ دوبارەدەکاتەوەو دەڵێت: لە کاتێکدا سوڵتانە عوسمانییەکان لەگەڵ پیاوەکان و سەربازەکانی سوپاکەیاندا دەژیان و پەیوەندیەکی پتەوو تۆکمەیان لەگەڵ ڕەعیەتەکانی خۆیاندا هەبوو، ئەوکات خۆیان دەیانتوانی لە نزیکەوە لێپێچینەوە لە کاروباری دەوڵەتەکەیان بکەن، بەلام دوای فەتحی قستەنتینیە ئەوان لە ڕەعیەتەکەیان دورکەوتنەوە، لێرەدا شتێکی

نویٚ دەڵێت کاتێك دەڵێت: دورکەوتنەوەو گۆشەگیربوونی ئەوان لە ئاکامی دیسپلینی ئاڵۆزو ئەو پرۆتۆکۆڵ و سرووتانەدا بو، کە لە بیزەنتەکانەوە بەجێمابوون، سەبارەت بە عەبدوڵلاَ تاتارجیق زادەش ئەم مەسەلە سوڵتان و وەزیرەکانی دابڕیبوو لەهەر جۆرە مەعریفەیەکی ورد لەسەر بارودۆخی دەوڵەت.

هەروەها ڕەخنە لە سیستێمی بەرتیل خواردن دەگرێت، کە سەرجەم دام و دەزگاکانی دەوڵەتی دووچاری گەندەڵی کردبوو. ڕەخنەشی لە سوڵتان و دەوروبەرەکەی گرتووە، چونکە کاربەدەستەکانیان ناچاردەکرد موچەی گەورە بدەن، ئەوانیش لای خۆیانەوە کاربەدەستانی لە خۆیان ئاست نزمتریان ناچار بە پێدانی پارە دەکرد، بەم جۆرە و بەشێوەیەکی هەرەمی گەندەڵی سەرجەم پلەو پۆستەکانی کارگێڕی گرتبووەوە.

سەبارەت بەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان بە دۆخی سەربازییەوە هەیە، ئەوا پێشنیاری چەندین چاکسازی و تین و توان دەکات،کە پێشتر نەبوون، لەوانە باشترکردنی گەنجینەو جبەخانەکان و بوونیادنانی کەشتی نویٚ و قایمکردنی قولەو قەلاَکان لە چەقە سنووریەکاندا، هەڵبەتە ئاشکرایە ئەوە لە ئاکامی ئاگاداربوون و زانینی تاتارجیق زادەوە بوو بۆ پێشکەوتنی سەنگەرسازی لە وڵاتە دراوسێکاندا، کە پێویستی بە هاویشتنی ئەم جۆرە هەنگاوانە دەکرد، هەروەها نیشانەو بەڵگەی بە ئاگابوونیشی بوو لە مەسەلەی ئەو پێشکەوتنەی ڕۆژئاوا پێیگەیشتبوو. دواتر ئەم بیرۆکە لای ناوەندەکانی نزیك بە سوڵتان دەبێتە بیرۆکەیەکی سەقامگیر. بەڕوویەکی تردا ڕاپۆرتەکەی بانگەشە بۆ بزاوتێکی یەکسانیخوازانە لە میانەی پێشنیارکردنیەوە بۆ ڕێکخستنی جزیە لای نا

موسڵمانەکان و داواکردنی بۆ نەهێشتنی زوڵم و زۆر لەسەر سەرجەم ڕەعایا[1].

پێچەوانەی تاتارجیق زادە، ئەبوبەکر ڕاتب ئەفەندی تا دوای چونی بۆ ئەوروپا لە ماوەی ساڵانی (١٧٩٢-١٧٩٣ز)دا، ڕاپۆرتە درێژەکەی خۆی نەنووسی. دوای ئەوەی سوڵتان ناردی بۆ ڤیەننا بۆ ئەوەی ڕەوشی دام و دەزگا کارگێڕی و حکومیەکان لەو وڵاتەدا بەسەربکاتەوە، و پاش ئەوەش وەسفێکی بینینەکانی خۆی بنووسێتەوە. ڕاتب ئەفەندی کوڕی یەکێك بوو لە کاربەدەستەکانی بابیعالی و لە دیارترین یاریدەدەرەکانی سەلیمی سێیەم و چاوقایمترین و ڕاشکاوترینیان بوو، ڕاتب ئەفەندی لە ساڵانی (١٧٩٥-١٧٩٦ز)دا پۆستی سەرۆکی نووسەران یان وەزیری دەرەوەی وەرگرتووە. بەڵام ناکۆکی لەگەڵ سوڵتاندا و ڕاشکاوییەکەی، لە کۆتاییدا بوونە هۆی ئەوەی سوڵتان لە ساڵی (١٧٩٧ز)دا فەرمانی کوشتنی دەربکات[2].

ڕاپۆرتەکەی ڕاتب ئەفەندی پێکهاتبو لە پێنج سەد لاپەڕەو بریتیبوو لە دوو بەش، بەشی یەکەمیان باس لەو مەسەلانە دەکات کە پەیوەندییان بە دام و دەزگا سەربازیەکانەوە هەیە لە وڵاتە ئەوروپیەکاندا، بەشێوەیەکی تایبەتیش لەوڵاتی نەمسا. بەڵام بەشی دووەمیان باس لەو مەسەلانە دەکات کە تایبەتن بە پرسەکانی حکومەت و کارگێڕی لە ئیمپراتۆریای نەمساوی-هەنگاریدا. هەروەها ڕاتب ئەفەندی لە ڕاپۆرتەکەیدا تیشك دەخاتەسەر ڕاوبۆچوونی بیرمەندە ئەوروپیەکان سەبارەت بە حوکمڕانی و دەوڵەتی مۆدێرن. لە ڕاپۆرتەکەیدا تایبەتمەندیەکانی دەوڵەتی

---

[1] SHAW. S. J.Between old new. PP. 93-94

[2] هەمان سەرچاوە، ل ل٩٦-٩٧.

مۆدێرنی پیشانداوە، سەرەتا بە کورتی ئاکامی بەسەرکردنەوە و ئەزموون و بینینەکانی خستۆتەڕوو، دەوڵەتی مۆدێرن بەگوێرەی بۆچوونی ڕاتب ئەفەندی ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

سوپایەکی مەزن و بە نەزم و دیسپلین، داراییەك کە وردبینی کرابێت، پیاوانێکی ڕۆشنگەرو متمانەپێکراو گیان لەسەردەست بۆ سەرخستنی وڵات، سووربوونی دەوڵەت لەسەر خۆشگوزەرانی و ئاسایشی گەل[1].

ڕاپۆرتەکەی ڕاتب ئەفەندی بەرگێکی ئەرشیفگەرانەی وەسفگەرانەی بۆ ئەو دام و دەزگایانەی کە لە ڤیەننا چاوی پێکەوتبوون، پۆشیبو، هەروەها ڕاپۆرتەکەی وەسفێکی ئەو ئامرازو کەرەستانەی بۆ چارەسەرکردن لە نەمسا بەکارهاتبوون تێدابو. ناوبراو بە شێوەیەکی تێروتەسەل باس لە کاری دام و دەزگا سەربازی و داراییەکان دەکات لە وڵاتە ئەورووپییەکاندا، هەروەها باس لە ڕێبازی کۆکردنەوەی باج و سیستێمی پۆستەو پیشەسازی ئاسن و زانستە کێڵگەییەکان و پیشەسازی و بازرگانی بانك ودام و دەزگا مۆدێرنەکانیتر دەکات.

سەبارەت بەئاقاری فیکریی ڕاتب ئەفەندیش، ئەوا لەنێو ئەو بیرمەندو فەیلەسوفانەی کە بیروبۆچوونەکانیانی خستۆتەڕو زیاتر بەلای ڤۆڵتێری بیرمەندی فەڕەنسیدا دایشکاندووە، هەر بۆیە لە ڕاپۆرتەکەیدا جەخت لە بایەخ و گرنگی ئازادی دەکاتەوە بۆ تاکەکان، بۆ ئەوەی دور لە کۆتەکانی دەوڵەت کارەکانیان ئەنجام بدەن. پێی لەسەر ئەو بیرۆکە داگرتووە کە دەڵێت: حکومەت بۆ ئەوە هاتۆتە بوون تا بەرژەوەندی گشتی و ئاسایشی تاکەکان بپارێزێت،

---

[1] KARAL, E. Z. La transformation de la turquie P. 431

ڕاتب ئەفەندی دەڵێت: "لە وڵاتە ئەورووپیەکاندا ئەو یاسا و ڕێساو باجانەی کە لە لایەن پاشاکانیانەوە دادەنرێت، ملکەچی سانسۆری دەستەو تاقمە جیاوازەکانی خەڵك دەکرێت، کە خەڵکی لە کاتی خۆیدا باجەکانی سەر شانیان دەدەن، ئەوا نە پاشاو نە ئەفسەرەکان و نە کاربەدەستەکان دەست لە کاروبارو ئارەزووەکانیان نادەن، لەم وڵاتانەدا تاك بەئارەزووو ویستی خۆی چی بوێت بێ کۆت و بەند لە بارەی خواردن و خواردنەوەی یان ڕۆیشتن و هاتنی خۆیەوە دەیڵێت".

بیرۆکەی سەرەکی کە لێرەدا مەبەستە، سنووردانانە بۆ باڵادەستی و هەژموونی دەسەڵات و تاکلایەنی فەرمانڕەوا لە بڕیارەکانیدا و سووربوون لەسەر پێویستی بەخشینی ئازادی بە تاکەکان وەك ئەوەی لەوڵاتە ئەورووپیەکاندا دەبینراو پەیڕەودەکرا، ئازادی لەو وڵاتانەدا پرنسیپێکی سەرەکییە لە پرنسیپەکانی پێشکەوتن و بووژاندنەوەی کۆمەڵگە، هەروەها لەوە دورتریش، ڕاتب ئەفەندی گۆشەنیگای وابوو یەکێك لە دیمەنەکانی ئازادی لە ئەورووپادا، خۆی لە ڕزگاربوون لە هەژموون و دەسەڵاتی ئایینی دەبینێتەوە. تا لێرەدا پێدەچێت سنووری پێویستی تێپەڕاندبێت، بەڵام ڕاتب ئەفەندی کە لە بیرکردنەوەدا ڤۆڵتێری بوو، سەبارەت بەم لایەنە دەڵێت: " ئەوان یاسای ئایینیان نیە، چونکە لە یاسا مەسیحییەکان تەنها ئەوانەیان هێشتۆتەوە کە پەیوەندیی بە ژن و ژنخوازییەوە هەیە، تەنانەت ئەم ڕووەی پیادەکرنی ئایینیە زۆر جار پاشاکان پێوەی پابەند نەدەبوون. هەروەها هۆکاری ئایینی لەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان بە میراتەوە هەبوو نەدەبینران، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین وڵاتە ئەورووپیەکان ناچنە ڕیزی ئەوانەی کە پێیان دەڵێن ئەهلی کتێب".

وەك ئاشكرایە ڕاتب ئەفەندی لە ڕاپۆرتەكەیدا سنووری پێشنیاز و چارەسەرسازییە كارگێڕی و سەربازییەكان تێدەپەڕێنێت، هەوڵدەدات ڕۆبچێتە نێو دام ودەزگا ئەوروپییەكان و قوڵایی كۆمەڵگەی ئەوروپییەوە. ئەو بۆچوونی وابوو دەوڵەت بۆ ئەوەی بەهێز بێت، پێویستە لە ڕووی سیستەمەوە هاوشان بە وڵاتە ئەوروپییەكان بڕوات و لە ریشەوە دام و دەزگاكانی هەمواربكاتەوە. مەسەلەی پێداگرتنیشی لەسەر دەرخستنی مانای ئازادی ئەوا ئاستی بایەخ و گرنگی ئەم چەمكەی دەسەلماند لە نێو بیروباوەڕە نوێیەكاندا، كە بۆ بیركردنەوەی ئیسلامی بە گشتی شتێكی نوێ بوو، تەنانەت كراوەیی زەین و هۆشی چارەسەرسازانەی خودی سوڵتانی تێدەپەڕاند[1].

## نووسینی مێژوویی

وێڕای پسپۆڕیی بابەتەكەی، بەڵام نووسینی مێژوویی نەكەوتبوە دەرەوەی بازنەی خزمەتی سوڵتانەكانەوە. بەگوێرەی خۆی كاریگەری بەڕووداوەكانی دەوروبەرو فەزای بەرهەم لە ژیاری نوێدا پیشانداوە، بینیمان چۆن مێژوونوسە عوسمانییەكان هەر لەسەرەتاكانی سەدەی حەڤدەهەمەوە گرنگییان دەدا بەوڵاتە دراوسێكانی دەوڵەتی عوسمانی، بینیشمان چۆن دەستیان دایە بەكارهێنانی سەرچاوەی نا ئیسلامیی بۆ پاڵپشتكردنی زانینەكانیان سەبارەت بە مێژووی ئەوروپا، هەر لە كاتی مەلهەمی و مونجم باشییەوە لە سەدەی حەڤدەهەم، و عەبدولڕەحمان مونیف "ساڵی ١٧٤٢ز مردووە" كە كتێبێكی بە ناونیشانی "پێڕستی وڵاتان" بەجێهێشتووە، لە چەند بەشێكیدا باسی ڕۆما و بیزەنتە و پاشاكانی

---

[1] بۆ پیشاندانی بیروباوەڕەكانی راتب ئەفەندی پشتمان بە باسێكی كورتی "SHAW" بەستووە لە لاپەرەكانی ٩٢-٩٦ی كتێبەكەیدا.

فەڕەنساو نەمسا دەکات، تا دەگاتە ئەحمەد ڕەسمی لە کتێبی "کورتەی ئیعتیبار" دا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم[1].

لە سەردەمی سەلیمی سێیەمدا مێژوونوس "عاسم عەنتابی"[2] دەرکەوت، کە مێژوویەکی نووسیوە بریتییە لە تۆمارێك بۆ ئەو ڕووداوانەی کەوتونەتە نێوان سالآنی (١٧٩١-١٨٠٨ز)، واتە بەشی هەرە بەرینی سەردەمی سەلیمی سێیەم. لە سەرەتای کتێبەکەیدا تیشکی خستۆتەسەر ئەو ڕیفۆرمانەی کە سەلیمی سێیەم ئەنجامی داون، لەو چوارچێوەیەدا باس لە ڕێکخستنە سەربازیەکانی و ئەو هەنگاوانەی بۆ ڕێفۆرمی جبەخانەی دەریاوانی نراون دەکات، هەروەها باس لەو کارانە دەکات کە لە بواری تۆپخانەدا ئەنجام دراون و ئەو سەنگەرسازیانەی لە دەروازەکانی ئەستەمووڵدا لێدراون.

پاش ئەوە بۆ نووسینی مێژووەکەی ڕەگەزێکی نوێی دەرەکی هێناوەتە ناوانەوە، ئەویش دروستبوونی "جمهوریە فرانسە" و داگیرکردنی فەڕەنسیەکانە بۆ میسر، ئیدی لەم ساتە بەدواوە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی مێژوویەکی داخراو نابێت بەڕووی خۆیدا، بەڵکوو مێژووی هاوپەیمانێتی دەبێت لەگەڵ وڵاتە ئەورووپیەکانی تردا. ئاماژە بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتی لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیاو ئینگلتەرادا دەکات، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەی فەڕەنسا، دواتر بەدرێژی ئاماژە بۆ دەقەکانی ئەو ڕێکەوتنانە دەکات، هەروەها ئاماژە بۆ ئەو باڵوێزانە دەکات کە سوڵتان پاش کشانەوەی فەڕەنسیەکان ناردنی بۆ پاریس، مێژوونووسی ناوبراو کەف و کوڵی بۆ فەڕەنسیەکان و شۆڕشەکەیان و کۆمارەکەیان و بیروباوەڕەکانی نەبوو، کە دەبوونە

[1] بگەڕێوە بۆ بەشی سێی ئەم کتێبە.
[2] تاریخ عاصم: دوو بەشە لە کتێبێکدا لە ئەستەمووڵ بێ مێژوو دەرچووە.

هۆی گەندەڵی و دەرچوون لە دۆخی باو لە نێوان نەتەوەکاندا. بەڵام عاسمی مێژوونوس نەیدەتوانی بێ لەبەرچاوگرتنی مێژووی ئەوانیدی مێژووەکەی بنوسێت. پەرەسەندنێکی نوێ لە نێوان وڵاتاندا سەریهەڵدابوو، کە نەدەکرا پشتگوێ بخرێت.

داگیرکردنی میسر لە لایەن فەرەنسیەکانەوە لە ساڵی (١٧٩٨ز)دا لە نێو مێژوونوساندا دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، نەك بەتەنها لە لای عاسمی مێژوونوسی فەرمی، کە لە دورەوە چاودێری ڕوداوەکانی دەکرد، بەڵکو لای مێژوونوسە ناتورکەکانی عوسمانی ئەوانەی کە هاوچەرخی ڕوداوەکان بوون، ئەو هاوچەرخبوونە گوتارێکی مێژوویی نوێی بەرهەمهێنا.

دەتوانین جەبرتی بە مێژوونوسی هێرشەکەی فەرەنسا بە تێڕوانینێکی تری نا فەرەنسایی دابنێین، نووسینەکانی بریتیین لە گوتارێکی ناوازەو دەگمەن، هەروەها دیالۆگێکە لەگەڵ داگیرکەرو تێکڕای ئەو بەهاو بیرو ئاوەزانەی لەگەڵ خۆی هەڵیگرتون. جەبرتی وەسفی ئەو هەرایە دەکات کە داگیرکەری فەرەنسی بەسەر دۆخێکی جێگیرو ئارامدا هێنای، ئیتر ئەم پەرچەکردارەی خوارەوە دەنووسێتەوە:

" شەو داهات و خەڵکی وڵات خۆیان لە نێو فیتنە و پشێویەکی مەزن و ونبوونێکی ئاڵۆزو داکشان و هەڵوەشاندنەوە بەستنەوەو مەنگیی و گۆشەگیریی و هەڵکەندن و گلۆربوونەوە و بارگرانیدا بینیەوە، لە کاتی عیشاشدا پڕوپاگەندە لە ناو خەڵکدا بڵاوبووەوە گوایە فەرەنگ بەرەو بولاق چون و سوتاندویانە، هەروەها چونە بۆ جیزە، بەوەش ترسیان زیادیکردو تۆقین"، هەروەها ئەم ڕوداوە گۆڕان بەسەر ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا دێنێت، دەڵێت:" ڕۆژانە خەڵك زیاتر کۆدەبنەوە و ترسەکەیان گەورەتردەبێت و خەڵك لە شار

دوردەکەونـــەوە و بـــەهۆی گســـك نـــەدان و ئاوەڕشـــێننەکردن و جێهێشـــتنی دوکانەکانـــەوە لـــە بازاڕەکانـــدا خـــۆڵ و خاشـــاك بەرزبووەتەوە"[1].

بەڵام دوای ئاماژەکردن بۆ ئەم گۆڕانە، جەبرتی لە میانەی ئەو ڕاگەیاندنەی لە هاتنە ناوەوەدا دابەشیانکرد لەگەڵ فەڕەنسییەکاندا کەوتە گفتوگۆ. لە گفتوگۆکردندا هەوڵیدا لە مانای دروشمەکانیان وەك کۆماری و یەکسانی و سەربەستی تێبگات، دەڵێت" کە دەڵێن ئەمە لای جەماوەرەوە تا دوایی... واتە ئەم نامە لە لایەن خەڵکەکەیانەوە نێردراوە واتە ئەنجومەنکەیان، چونکە ئەوان گەورەو سوڵتانیان نییە دەنگیان وەك ئەوانیتر کۆبکاتەوە... بەڵکوو فرمـــانی دەوڵـــەت و وڵاتیـــان و بڕیارەکانیـــان و ئیـــدارەدانی کاروبارەکانیان داوەتەدەست خەڵکە ژیرو عاقڵەکانیان... بە مەرجی یەکسانی و جیاوازی نەکردن، چونکە لە بناغەدا خەڵکی یەکسانن... ئەمەش مانـای گوتەزاکەیانـە کـە لەسـەر بناغـەی سەربەسـتی و یەکسانی بوونیادنراوە، مەبەستیان لە سەربەستی بەو مانایە دێت، کە ئەوان وەك مەمالیك کۆیلە نین... گەورە و بچووك، پیاوچاك و پیاو خراپ، و نێر و مێ، یەکسانن"[2].

بەڵام ئەوشتەی سەرنجی جەبرتی ڕاکێشاوە خوو ڕەوشتی فەڕەنسییەکانە بەراورد بە خوو ڕەوشتی میسرییەکان. هەڵس وکەوتی فەڕەنسییەکان سەرسامیان کردووە: "پێدەچێت هەندێ جار

---

[1] الجبرتي، تاريخ مدة الفرنسين في مصر، لەگەڵ وەرگێڕانێکی ئینگلیزیدا بڵاویکردۆتەوە.

Morch,s: Chronicle of the first seven months of the French occupation. Leiden. E. J. Brill 1975.PP. 23-24

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٢.

بەگوێرەی ئارەزووو و مەیلی دەروون و بەگوێرەی عەقڵیان ڕەفتاریان کردبێت و تاوانیشیان ئەنجام دابێت. ژنەکانیشیان پۆشتە نین و شەرم ناکەن...". بەڵام ئەمانە ڕێگرنەبوون لەوەی جەبرتی بە زانستە نوێیەکان و هەروەها بە ئامێرە ورد داهێنراوەکانی ڕۆژئاوا کە فەرەنسییەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان سەرسام بێت: "داخوازییان بۆ زانستەکان زۆر بوو بە زۆریش وەرزش و زانینی زمانەکان، هەوڵێکی مەزنیشیان دەدا بۆ زانینی زمانی عەرەبی.. ئامێری گەردوونیی ڕۆژئاوایی ورد داهێنراوو ئامێرەکانی بەرزایی سەرنج ڕاکێش و قەشەنگ دروستکراوو گرانبەهایان هەبوو، هەروەها دووربین بۆ تەماشاکردنی هەسارەکان و زانینی قەبارە و فۆرم و بەرزی و پەیوەندیەکانیان"[1].

مێژوونوسێکی تر کە مێژوویەکی بۆ هەمان قۆناغ نووسیوە "نیقۆلا تورک"ە کە پەلاماری لە ناکاوی فەرەنسیەکان شڵەژاندویەتی، ئەم شڵەژانەشی بە تێڕوانینی ناکۆك و دژ بەیەك دەربڕیوە، بەدیوێکدا دەڵێت" ئەوە دەستپێکی دۆڕان و سەرەتای پێچلێدانە... چونکە فەرەنساویەکان بۆ مەیسەرکردنی کارەکانیان فرت و فێڵی زۆریان بەکارهێناوەو ڕێبازی جۆراوجۆریان گرتۆتەبەر، وەك شاردنەوەی نەسرانیبوونیان و دەرکەوتنیان لە بەرگێکی ئیسلامەتیدا و خۆدەرخستنیان بەوەی ئازادیخوازن..."[2]، بە دیوەکەی تردا دەڵێت" ڕەوشتیان لە تێکڕای ڕەگەزەکانی تر باشتربو، بە ئارامی و دەروونپاکی ناسرابوون، یەکسانی و ئەحکامی باشیان بڵاوکردەوە و یاساکانیان کامڵ و تەواوبوو".

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ٢٩.

[2] گوایە کتێبی (نقولا الترك)ە. حیدر الشهابی لە چوارچێوەی کتێبی (لبنان فی عهدالامراء الشهابیین) ج١، فی المطبعة الکاثولیکیة ١٩٣٣ دا بڵاویکردۆتەوە.

سەبارەت بەراقەکردنی هاتنی فەرەنسیەکان بۆ میسر، نیقۆلا تورك دەگەرێتەوە بۆ سەرەتاکان، ئەو رووداوانە دەگێرێتەوە کە لە چەند سالی رابوردوودا فەرەنسا بەخۆیەوەدیتی، ئیدی مێژوویەك بۆ شۆرشی فەرەنسی دەنوسێتەوە کە تیایدا هاتووە: "لە سالی (١٧٩٣ز)دا، لە شاری پاریس بەلایەکی مەزن روویدا خەلکی ئەم مەملەکەتە هەلچوونێکی مەزن هەلچوون، لەدژی سولتان و میرو خانەدانەکانی راپەرینێکی مەزنیان بەرپاکرد...داوای نەزم و رێسای نویێ و تەرتیباتی نوێیان دەکرد.. بانگەشەی ئەوەیاندەکرد کە بوونی سولتانێکی تاك دەنگ، وێرانەیەکی مەزنی لە ولاتدا دروستکردووە، خانەدانەکانی نازو نیعمەتی خێرەکانی دەخۆن و باقی خەلکەکەی تر ماندوبوون و نارەحەتیەکانیان بۆ دەمێنێتەوە"[1].

لەواقیعدا گێرانەوەی بۆ مێژووی رووداوەکانی فەرەنسا، کە بەدرێژیی چەندین پەرە بەردەوام دەبێت کە تارادەیەکی زۆر تێبینیەکانی وردن، ئاگابوونی لە رووداوەکان بەلگەن لەسەر ئەوەی کە گواستنەوەی زانیارییەکان تا رادەیەکی زۆر خێراو وردبوون: "پیاوانی شۆرش نوسراویان بۆ تێکرای پاشاکان هەنارد تا لە پالپشتکردنی دەولەتەکەیان ئاگاداریان بکەونەوە، لە نوسراوەکانیاندا ئەمە هاتبوو؛ هەر لایەنێك دان بە شێخنشینەکەماندا بنێت ئەوا دۆستی ئێمەیە، ئەوەشی دانیپێدانەنێت ئەوا دوژمنی ئێمەیەو بۆ جەنگی ئێمە خۆی ئامادەدەکات، چونکە ئێمە ئامادەین لە دژی هەمو دونیا بجەنگین، بۆ دەولەتی عوسمانیش هەمان شتیان نوسی.. بەلام پاشاکانی ئەورووپا کاتێك نوسراوی فەرەنساویەکانیان پێگەیشت هەر زوو هەمویان

[1] هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٥.

ڕێکەوتن و بڕیاریاندا لە دژی ئەو گەلە لە ڕێسا دەرچووە بجەنگن، نەك گەلانی تر دوایان بکەون"[1].

ئاشکرایە شۆڕشی فەڕەنسی بە شوێنەوارە سیاسییە ڕاستەوخۆکانی لەسەر ولاتانی ئەورووپاو دەولەتی عوسمانی، گۆڕانێکی بەسەر نووسینی مێژوویدا لای عوسمانییەکان هێنا، نووسینەکانیان بۆخۆی دەنگدانەوەی ئەم گۆڕانکارییانە بو پێش ئەوەی سەدەی هەژدەهەم ئاوابێت. لەم چوارچێوەدا کۆسمۆ کۆمیدۆس (Kosmo Komidos)ی بنەچە یۆنانی مێژوویەکی بەزمانی تورکی نووسیوە، تیایدا باسی لە ولاتانی ئەورووپا کردووە و زانیاری لەسەر پاشاکان و پایتەختەکان و دۆخی ئەو ڕۆژگارەیان داوە، ئەمە لە سالی ١٧٩٩ دا بووە[2].

لە سالی (١٨٠٥ز)دا عەتاللا موحەمەد کە بە شانی زادە ناسرابوو(١٧٦٩-١٨٢٦) کتێبێکی بەناونیشانی "وصایا نامە" (Visayaname-i-seferiyye) نووسیوە، کە بریتیبو لە وەرگێڕانی کتێبەکەی فردریکی گەورە، هەروەها شانی زادە، کە شارەزایی لە چەند زمانێکی ئەورووپیدا هەبو لە نێوان سالانی (١٨٠٨ و١٨٢٠)دا مێژوویەکی بۆ دەولەتی عوسمانی نووسیوە، کە تیایدا چەندین سەرچاوەی ئەورووپی بەکارهێناوە[3].

لەگەل ئەو نووسەرانەدا، کە هەولیان دەدا دوو مێژوو لە یەکتر نزیکبخەنەوە، ئیدی مێژووی عوسمانی هاوکات لەگەل مێژووی جیهاندا هەنگاوی هەلدەگرت.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ٢١٣.

[2] Lewis, B:The Use By muslim.. P189.

[3] هەمان سەرچاوە، ل ١٩٠.

## شیعر

حیكایەتی میللی و شیعر لە ولأتی عوسمانیدا تا سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەمیش دوربوون لە كاریگەرییەكانی ئەوروپا. بەشێوەیەكی سەرەكیی هۆكاری ئەمە دەگەڕایەوە بۆ دوركەوتنەوەی بابەت و ناوەڕۆكەكانی لەو مەسەلانەی كە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەگەڵ ڕیفۆرم دا هەبو. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرە نزیكەكان لە سوڵتان بەگشتی دورنەبوون لە فەزای كرانەوە.

هەر لە ساڵی (١٧٥٧ز)وە حیشمەت-ی شاعیر[1] بە ئاگابوونی خۆی لە دۆخی ولأتە ئەوروپییەكان پیشاندا، ئەمەش نیشانەی بایەخی زیاتری چینی فەرمانڕەواو دارودەستەكەیانی بە ڕەوشی دەوڵەتانی ئەوروپا بوو. لە چوارچێوەی پیاهەڵدانیدا بۆ سوڵتانی نوێ موستەفای سێیەم حیشمەت-ی شاعیر باس لە پاشاكانی ئەوروپا دەكات و بۆ هەر یەكێكیان لای سوڵتان پیشەیەكی بۆ داناون، ئەم پیشەی كە پێشنیاری دەكات بۆ هەر یەك لە پاشاكانی ئەوروپا لەگەڵ بەرهەمە سەرەكیەكانی ولأتەكەیدا كە پێی دەناسرێتەوە گونجاوە، لێرەدا لای شاعیر ئەركێكی تر دەستپێدەكات، ئەویش قسەكردنە لەسەر بەروبومی ولأتانی ئەوروپا، بە جۆرێك ئەمیش بەڕۆڵی خۆی بەشداری بابەتە چارەسەرسازییە باوەكانی ئەو ڕۆژگارە دەكات، كە ئەویش پێشكەوتنی ولأتانی ئەوروپایە[2].

---

[1] المصری. حسین مجیب. فی الادب الترکی القاهرة.ص١٦٤.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ١٦٥.

لە سەردەمی سەلیمی سێیەم-یشدا ئاگابوون لە بارودۆخی ئەورووپا بەگشتی لای شاعیرەکانیش بەرفراواندەبێت، یەکێك لەو شاعیرانەی لەو سەردەمەدا دەردەکەوێت فازڵ بەگی شاعیرە (١٧٥٧-١٨١٠ز) کوڕی ضاهر ئەلعومەری والی عەکا بو، کە دوای کوشتنی باوکی لە ساڵی (١٧٧٥ز)دا دەچێت بۆ ئەستەمبوڵ و دواتر بە شیعری غەزەل ناوبانگ پەیدادەکات[١].

یەکێك لەو بابەتانەی فازڵ بەگ لە سەری نووسیوە بابەتی ژنانە، ئەم بابەتەش خۆی لە ئەدەبی تورکی و ئەدەبیاتی ئیسلامیدا بەگشتی نوێ نیە، بەڵام ئەو تازەگەرییەی کە فازڵ بەگ لە کتێبەکەیدا دەریخستووە، تەرخانکردنی چەند بەشێکە بۆ قسەکردن لەسەر ژنانی وڵاتە جیاوازەکانی ئەورووپا[٢]، دوای ئەوەی کتێبەکەی کردۆتە چەند بەشێکەوە، هەر بەشێکی تەرخانکردووە بۆ قسەکردن لەسەر ژنانی نەتەوە جیاوازەکان، کە دەگاتە ژنانی ئەورووپا، ئەوا لە چەند بەشێکی سەربەخۆدا باس لە ژنی یۆنانی و بۆهیمی و ئەڵمانی و ئەلبانی و دانوبی و فەڕەنسی و پۆڵۆنی و ئیسپانی و ئینگلیزی و ڕووسی و هۆڵەندی و ئەمریکی-ش دەکات، ئەو زانیاریانەی لەسەر ژنانی ئەم وڵاتانە پێشکەشی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە کورتن هێشتا سەبارەت بەهەندێ داب و نەریتی گەلان لە ئەورووپا هەندێ وردەکارییان تێدایە. سەبارەت بە ژنانی فەڕەنسا کە لە ژنانی وڵاتانی تر زیاتر لە سەریان وەستاوە دەبینین بەراورد بەژنانی ڕووسی و ئەمریکی کە حەزی پێیان نەبوو لەسەر

---

[1] Mordtmann, J. H: art Fadil Bey. Ei2, vol. 2, p. 746

[٢] کتیبەکە بە ناونیشانی (زنان نامە) یان کتێبی ژنانەیە، لێرەدا گەڕاینەوە سەر وەرگێڕانە فەڕەنسییەکەی:

- Fadil bey: Zenan – name. traduit du turc par J. A. Decourdemanche paris 1879

پیاهەڵدانی خەسڵەتەکانیان دەڕوات. ئەوەی تێبینیکردووە ژمارەی ژنــان لــە فەڕەنســا لــە ژمــارەی پیــاوان زیــاترە. بــەڵام هەنــدێ لــە نەریتیەکانیان سەرسامی کردون، بەتایبەت حەزو مەیلیان بەرامبەر سەگ و ڕەفتاریان بەرامبەر ئەم ئاژەڵە، وەك ئەوەی منداڵبن. هــەروەها لۆمەی بەشداریکردنی ژنانی فەڕەنسای لە ڕوداوەکانی شۆڕش و خوڵقاندنیان بۆ نائارامی و پشێوی کردووە ئەمە گەیشتنی هەواڵی ڕوداوەکــانی فەڕەنســا بــۆ ئەســتەموولێ بــە وردەکاریــەکانی ژیــانی ڕۆژانەیشەوە دەسەلماند[1].

دەتـوانین لێرەدا نـاوی شـاعیرێکی تـر لـە شـاعیرەکانی سـەلیمی سـێیەم بێـنین، ئـەویش واسـف ئەلئەنـدرونی-یـە (لـە سـاڵی ١٨٢٥ مردووە)، کە لە کاتی داگیرکردنی ناپلیۆن دا بۆ میسر قەسیدەیەکی درێـژی نووسـیوەو بەشـداری ڕوداوەکـانی سـەردەمەکەی خـۆی پێکردووە، واسف دەڵێت: "ئـەو کافرە فەڕەنسیە لە دەریاوەو بە دزییەوە خۆی کرد بە میسرداو لە کەشتی دوڕوویدا هاتە نێو ئاوی ئەسکەندەریە، ئەم قەومە فیتنەییان بەرپاکرد... لە دۆڵی ساڵحییەوە خراپــەکاریان بڵاوکــردەوە و خــەڵکیان بــە فــەرمانێکی ناڕاســت چەواشەکرد، کاتێك پاشای زیرەك و بەخشندە ئەم هەواڵەی بەرگوێ کەوت، لەژێر ئاڵای فەرماندەکەیدا لەشکرێکی مەزنی ڕەوانەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان"[2].

لەگــەڵ ئەوەشــدا شــیعر بــە قوتابخانــە نوێیــەکانی ئــەورووپا کاریگەرنەبوو تا سەردەمی تـەنزیمات (١٨٣٩-١٨٧٦ز). لـەم کات و قۆناغــەدا کــە دەوڵــەتی عوسمــانی بزاڤێکــی ڕیفــۆرمی سیاســی بەخۆوەدەبینیێ، لە بانگەشەکردندا بۆ ڕیفۆرم و وەرگرتنی بیروباوەڕە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ١١١-

[2] المصري. فی الادب الترکي القاهرة.ص١٦٤.

لیبراڵییەکانی ئەورووپا شاعیرەکان لە ڕیزی پێشەوەدا بوون، لەوانە زیا پاشا (١٨٢٥-١٨٨٠) کە لە یەکەمین ئەو شاعیرانە بو کاریگەری شیعری فەڕەنسییان لەسەر دەرکەوێت، پاشان نامق کەمال (١٨٤٠-١٨٨٨ن)، کە جەختی زۆری لە چەمکەکانی ئازادی و نیشتمان و گەل دەکردەوە[1].

---

1 Bombaci, A: L'hstoire De la letterature torque.. PP.359-362

ڕوونترین کاریگەری فەڕەنسی لەسەر عوسمانییەکان، دەرکەوتنی چەندین نوسراوو کتێب بوو بەزمانی فەڕەنسی لە ئەستەمبول دا، کە لە پێش سەدەی هەژدەهەم بەدەستی عوسمانییە موسڵمانەکان نوسرابوون. یەکەمین ئەو نووسەرانەی کە بەزمانی فەڕەنسی دەیاننووسی، مەحمود ڕەئیف بو، کە بێجگە لە نووسینی ڕاپۆرتێك بەزمانی فەڕەنسی سەبارەت بە گەشتەکەی بۆ ئینگلتەرا، لە ساڵی (١٧٩٨ن)دا، کتێبێکی گرنگی بەناونیشانی "خشتەی تەنزیماتی نویێ لە دەوڵەتی عوسمانیدا" بلأوکردۆتەوە[1]. (سەید موستەفا)ش نووسەرێکی ترە کە بەزمانی فەڕەنسی کتێبێکی بەناونیشانی "ڕەخنە لە دۆخی هونەری سەربازی ئەندازیاری و زانستەکان لە قەستەنتینیە" نووسیوەو لە ساڵی (١٨٠٣ن)دا بلأویکردۆتەوە[2]. بێجگە لەم دوو نووسەرە ژمارەیەکی تر لە ڕۆشنگەرە عوسمانییەکان و ئەوانەی لە بواری فێرکردن یا کارگێڕیدا کاریاندەکرد لە هەمان قۆناغداو لە سنوورێکی بەرفراواندا شارەزاییەکانیان لە زمانی فەڕەنسیدا بەکارهێناوە بۆ وەرگێڕان و پۆلێنکردنی کتێب و ئامادەکردنی فەرهەنگ، کە لە ئاکامدا کەشێکی فیکری نوێیان لە ئەستەمبوڵ دا هێنایەئارا.

ئاکامەکانی بەکارهێنانی زمانێکی جیهانی چی بوو؟ هۆی چی بوو، کە مەحمود ڕەئیف و سەید موستەفا بۆ نووسین، زمانی فەڕەنسییان هەڵبژارد؟

---

[1] Raif, M:Tableau des nouveanx reglements de L'Empire Ottoman: Constantionople 1798

[2]

## بەکارهێنانی زمانێکی نوێ

هەڵبـژاردنی زمـانی فەڕەنسـی بـۆ نووسـین لـە نێـو تێکـڕای زمانەکانی تری ئەورووپیدا، پێگەی تایبەتی ئەم زمانە دەسەلمێنی لای عوسمانییەکاندا. هەڵبژاردنی ئەم زمانە تەنها ڕێکەوتێك نەبو، بەدیوێکدا پەیوەندیەکانی فەڕەنساو دەوڵەتی عوسمانی ڕۆڵی خۆی لە چەسپاندنی پێگەی زمانی فەڕەنسیدا هەبو لای عوسمانییەکان، بەدیوەکەی تردا لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا لە بازنەی ئەورووپیدا فەڕەنسا وەك پێشکەوتووترین دەوڵەتەکان خۆی دەنواند.

پێدەچێت پەنابردن بۆ نووسین بە فەڕەنسی بە پلەی یەکەم مەغزایەکی هێمـایی هـەبووبێت، چـونکە لـە لایـەن دڵگـەرمترین کەسـەکانەوە بـۆ بیروبـاوەڕی ڕیفۆرمخـوازی دەردەچـوو، ئەوانـەی کەوتبوونە ژێر کارتێکردنی بیروباوەڕە ئازادیخوازیە نوێیەکانەوە.

سەرباری کەمی ژمارەی کتێبەکان، لەگەڵ گەورەبوونی ژمارەی ئەوانـەی لـەم زمانـەدا شـارەزاییان هـەبو، هەڵبـژاردنی زمـانێکی ئەورووپی بۆ نووسین نیشانەیماڵئاوایکردن بوو لە هەردوو زمانی فارسی و عەرەبی، کە هاوشان بە زمانی تورکی لە لایەن تورکەکانەوە بەکاردەهێنرا.

لە سنووری بازنەی لایەنگرانی ڕیفۆرمیشدا کە کاریگەربوون بە بیروباوەڕە نوێیەکان کە لە ئەورووپاو فەڕەنساوە بە تایبەت دەهاتن، نووسین و خوێندنەوە بە زمانی فەڕەنسی بە مانـای دابڕانێکی ڕیشەیی دەهات لە میتۆدێکی فیکری باوو باڵادەست لە ماوەی چەندین نەوەو پەیوەندیکردن لەگەڵ میتۆد و فیکرێکی نوێ-دا.

نووسین بەم زمانە چەندین هۆکاری لە پشتەوەبوو، بەدیوێکدا خواستەکانی گەردوونگەرایی و بەجیهانیبوون و دەرچوون لە بازنەی گۆشەگیری دەهێنایەدی، کارێك کە زمانە ئیسلامیەکان بۆیان جێبەجێ نەدەکرا، زمانی فەرەنسی مانای ناسینی ژیارێکی نوێ و زانستێکی نوێی دەگەیاند، کە لە لای بانگهێشتکارانی ڕیفۆرم هێمابوون بۆ هەمو ئەو شتانەی ئاماژەیان بۆ پێشکەوتن دەکرد. بە دیوێکی تردا سەبارەت بە تورکێك کە دەیدیت کەلەپورەکەی بە زیاد لە زمانێك نوسراوەتەوە، بە بەکارهێنانی زمانێکی تری نامۆ، دەبێتە خاوەن هێزێك کە زمانە ئیسلامیەکانی تر نابنە خاوەنی.

دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین، کە نووسین بە زمانی فەڕەنسی، بێتوانایی زمانی تورکی لە بەکارهێنانی تێرم و زاراوە نوێکاندا پڕدەکردەوە، ئەو نووسەرەی کە دەیویست بیروباوەڕی نوێ دابڕێژێتەوەو نووسینەکانی پێویستی بە بەکارهێنانی هەندێ زاراوە هەبوایە، دەیتوانی لە فەڕەنسیەوە وەریبگرێت. بە دیوێکی تردا داڕشتنەوە و نووسین بە زمانی فەڕەنسی یارمەتیدەربو تا ئەو نووسین و هەولانە لە ڕەخنەی گروپە سونەتیە کۆنەپارێزەکان بەدوربێت، چونکە ئەو نووسینانە لە بنەڕەتدا بە ئاقاری کرانەوەو ڕەخنەگرتن بوو لە ئاراستەی خودی کۆنەپارێزەکان و سوپای ئینکیشاری. لەگەڵ ئەوەشدا نووسین بەم زمانە بۆخۆی لای نەیارانی ڕیفۆرم جۆرێك بو لە کوفرو ناسزایی. تەنانەت هەردوو نووسەر مەحمود ڕەئیف و سەید موستەفا پاش ڕاپەڕینی ئینکیشاریەکان لە ساڵی (١٨٠٧ز) و لەکارخستنی سوڵتان سەلیمی سێیەم دەربازنەبوون، ئەوەبوو لەگەڵ چەندین کەسی تردا لە گۆڕەپانی مەیدان لە ئەستەمووڵ لە سێدارەدران، کتێبەکانیشیان لەگەڵ

نووسین و دەستکەوتەکانی تری ڕیفۆرمدا بەر سوتان و لە نێوبردن کەوتن.

## "تەنزیماتی نوێ"

مەحمود ڕەئیف کوڕی عەبدولڕەحمان ئەفەندی بو، کە لە بابیعالیدا ڕاژەیکردووە، لەو جێگەی خودی مەحمودی تیا پەروەردەو ڕاهێنرابوو بۆ ڕاژەکردن[1]، یەکەمین ئەو ئەرکانەی لە سەردەمی سەلیمی سێیەمدا خرایە ئەستۆی، ئەرکێکی دیبلۆماتی بوو بۆ لەندەن. لە ماوەی دوو ساڵدا تاکە سەفیری هەمیشەیی بووە لە پایتەختێکی ئەورووپیدا، لەو ماوەدا کە لە لەندەن بووە وەسفی جێبایەخەکانی خۆیمان بۆدەکات، سەرباری کارە فەرمیەکەی، لەو ماوەدا گرنگی بە زانست و بەسەرکردنەوەی دام و دەزگا مۆدێرنەکان و ناسینی فۆرمی حوکمڕانی داوە. لە دەستپێکی کتێبەکەیدا دەڵێت: "کاتێك توانیم هەندێ لە پرنسیپە بەراییەکانی زمانەکە فێربم، حەزم دەکرد بە قووڵی سەبارەت بەو شتانە بزانم کە جێبایەخی کارگێریەکانی ئەورووپا بوون، ئیدی بەتەواوی خۆمم تەرخانکرد بۆ خوێندنی جوگرافیاو مێژوو و سیاسەت و یاسای گشتی. هەرچی کاتە بەتاڵەکانیشم بو، ئەوا بە تێبینیکردن و سەرنجدانی تێکڕای ئەو شتانەی بەرچاوم دەکەوتن، پڕدەکردەوە، هەر لە تێبینیکردنی سیستمی دارایی هێزەکانی ئەورووپاوە تا دەگاتە دۆخی ئەو وڵاتانە لە ڕووی سەربازی و هێزی دەریاوانیەوە، بە کورتی سەرجەم ئەو شتانەی پەیوەندیان بە حکومەتەکانەوە هەبوو"[2].

---

[1] - SHAW. S. J:Between old and new. P.188

[2] Raif.M. Tableau des nouveaux…P 4.

ئەم گرنگیدانەی کە مەحمود ڕەئیف لە دەستپێکی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، دڵگەرمی لایەنگرانی ڕیفۆرم و حەزو ئارەزوویان بۆ زانینی ڕەوشی تەواوی دام و دەزگا مۆدێرنەکان لە ئەوروپا دەسەلماند، هەروەها گۆشەنیگای ئەو ڕۆشنگەرانە سەبارەت بە خودی خۆیان وەك خوێندکارێك لە خوێندنگە مۆدێرنەکانی ئەوروپادا دەسەلماند.

مەحمود ڕەئیف دوای گەڕانەوەی بۆ ئەستەموولْ خۆی بۆ نووسینی چەند کتێبێك تەرخانکرد، لەوانە نامەیەك دەربارەی جوگرافیا، لەو ماوەدا نازناوێکی نوێی لێنرا ئەویش "ئینگلیز مەحمود ئەفەندی" بوو. لە ساڵی (١٨٠٠ز)دا سوڵتان پۆستی سەرۆکی نووسەران (وەزیری دەرەوە)ی پێسپارد، پێنج ساڵ لەو پۆستەدا مایەوە ئەمەش درێژترین ماوەبو کە تیایدا وەزیرێك لە سەردەمی سەلیمی سێیەمدا لە پۆستەکەیدا بمێنێتەوە[1].

بۆ تێگەیشتن لە شوێن و پێگەی زمانی فەڕەنسی لای ڕۆشنگەراکانی ئەستەمبوڵ و تەماشاکردنی لە لایەن ئەوانەوە وەك ڕێبازێك بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانی نوێوە، دەبینین مەحمود ڕەئیف وێڕای ئەوەی لە لەندەن دامەزراوە کەچی لە بری زمانی ئینگلیزی سەرقاڵی خوێندنی زمانی فەڕەنسی بووە، لەم ڕووەوە دەڵێت: "بۆ تەنها ساتێك دوودڵیم نەکرد لە قبووڵکردنی ئەو ئەرکەی کە بە گونجاوو شایستەم زانیوە خێرا خۆمم بۆ ئەم گەشتەم سازو ئامادەکرد، لەبەر ئەوەی بیرۆکەکە ویژدانی داگیرکردبووم، بایەخی سەرەکیم بو بە دەستکەوتنی کتێبێکی ڕێزمانی فەڕەنسی لەگەڵ فەرهەنگێکدا. ئەوەبو خۆمم ڕاهێنا لەسەر خوێندنی زمانی فەڕەنسی

---

[1] زانیاری لەبارەی ژیانییەوە لە (SHAW )دا دەستدەکەوێت.

بەو سیفەتەی زمانێکی جیهانیەو دەتوانێت پێداویستیەکانم بێنێتەدی"[1].

هەرچی هۆکارەکانی نووسینە ئەوا بەم شێوەی خوارەوە باسیکردون" لە سەرجەم ئەوروپادا خەڵکی لە دۆخی ئێستای سوپاو داهاتەکانی سەڵتەنەتی عوسمانی بێئاگان، لێرەوە دەتوانم بڵێم ئەم هەوڵە ڕەنگە هەندێ سوودبەخشبێت.. بەم چەشنە پاڵنەری من هەستکردنە بە جوانیەکان، بۆیە بڕیارمدا لەبارەی ئەو تەنزیماتانەی خاوەن شکۆ جێبەجێیکردون، بەزمانی فەڕەنسی باسێك پێشکەشبکەم، ئەوکات تێکڕای ئەورووپا دان بەدڵگەرمی ئەودا دەنێن کە لە پێناو بوژانەوەی دەوڵەتەکەیدا ماندونابێت، هەروەها دان بەدانایی و بێهاوتایی ئەودا دەنێن"[2].

مەحمود ڕەئیف کتێبەکەی تەرخانکردووە بۆ نیشاندانی ڕیفۆرمەکانی سەلیمی سێیەم. بەتایبەت ئەوانەیان کە پەیوەندی بەڕێکخستنە سەربازیەکانەوە هەبووە. بەڵام نەیپەرژاوەتە سەر نیشاندانی تەواوی ڕیفۆرمەکانی سەردەمەکەی بە تایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندیان بە بوارەکانی ڕۆشنبیری و فێرکردنەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییانەی سەرنجداوە کە لە نێوان نەوەی کۆن و نوێدا هەبووە. ناکۆکی لەگەڵ سیستمی کۆندا بیرۆکەیەك بو شۆڕشی فەڕەنسی بڵاویکردەوەو نووسەر پەیڕەوی کرد. لەسەر ئاستی عوسمانیش سیستمی کۆن خۆی لە سوپای ئینکیشاریدا دەبینیەوە کە پێوستبو لەناوببرێن و لە بری ئەوان سوپایەکی نیزامی پێکبهێنرێت. بۆ دەربڕینی بیرۆکەکەیشی دەڵێت: "ئایا شتێکی سەیرە هەرەمی سیاسی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دوای

---

[1] Raif.M. …P 4.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٨.

دوو سەدە توشی هەندێ هەژان بێت و لە ئێستادا پێویستی بەوە هەبێت پیاوێکی شایستە چاکسازی بۆ ئەنجام بدات، نیمچە مەحاڵ نیە لە ماوەیەکی کورتدا چارەسەرێکی شیاو بۆ نەخۆشیەکی بەو رادە کۆن و لەسەرخۆ تەشەنەسەندووە بدۆزرێتەوە". وەك دەبینین کە نووسەر بە ناو هێما بۆ ئەم نەخۆشییە دێرینە دوو سەدەییە ناکات، بەلام زۆری پێناچێت مەبەستەکەی راڤەدەکات و دەڵێت: "سوڵتانی خاوەن شکۆ تەنها ئەو کەم و کورتیانەی چارەسەرنەکرد کە پێشتر روویانداوە، هەروەها بە چارەسەرکردنی سەرجەم بەشە کارگێڕیەکانەوە نەوەستا، ئەو ویستی سوپایەکی نوێی رێکخراو لەسەر شێوازی ئەوروپی پێکبهێنێت"[1].

بەشی زۆری کتێبەکەی مەحمود رەئیف، کە بە زمانی فەرەنسی نوسرابوو، بۆ نیشاندانی ریفۆرم و تەنزیماتە نوێکان تەرخانکرابو، بەم کارە دەیویست ئەو ریفۆرمانە بخاتە پێشچاوی ئەوروپیەکان، وەك هەوڵێکیش بۆ راکێشانی متمانەی ئەوروپییەکان بە جدیبوونی هەوڵەکانی سەلیمی سێیەم، لە دەستپێکی کتێبەکەیدا ئەم مەسەلەی گوزارشت لێکردووە. بە دیوێکی تردا تێبینی ئەوەدەکەین کە بیرۆکەی رێکخستنی کۆمەڵگە بەسەر زەینیدا زاڵبووە، سەبارەت بە ئەو نیزام مانای نەهێشتنی رێبازە ئاژاوەگێڕییەکانی دەگەیاند لە بواری کارگێڕیدا کە باڵیکێشابو بەسەر دام و دەزگاکاندا. لێرەوە بە تەنها دەستپێکردنی ئەم هێڵە چارەسەرسازییە مانای کرانەوەی هێڵی گۆڕانی دەگەیاند: "بەم چەشنە بوونی دڵۆپێك ئاو بەسبوون بۆ هێماکردن بۆ بوونی رووبارێك و دەستنیشانکردنی شوێنی رێڕەوەکەی"[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٥٩.

## میتۆدێك بۆ ڕەخنە

نووسەرێکی تورکە لە سەردەمی سەلیمی سێیەمدا کتێبێکی بچوکی بە زمانی فەڕەنسی نووسیوە، سەید موستەفایە، کە لە ژیانیدا سەفەری نەکردبوو بۆ هیچ ولاّتێکی ئەوروپی، وێڕای حەزو ئارەزووی بۆ ئەم مەسەلە. لەگەڵ ئەوەشدا بەو توانایانەی لەو ڕۆژگارەدا لەبەردەستدابوون، توانی لە ئەستەمبوڵ دا خۆی فێری فەڕەنسی بکات.

سەید موستەفا یەکێك بو لە تاکەکانی نەوەی نوێ، کە لە ڕەوشی ئەزمونی ریفۆرم دا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم پێگەیشتن و یەکێك بوو لە قوتابییەکانی خوێندنگە نوێکان، ئەوانەی فێرکردن تیاندا لەسەر شێوازی ئەوروپی بوو. ئەو زانیارییە کەمەی سەبارەت بە سەید موستەفا هەیە، خۆی لە پێشەکی کتێبە قەبارە بچووکەکەیدا پێشکەشیکردووە، ناوبراو لە ئەستەمبوڵ لەدایکبووە و هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنی زانستەکان و ماتماتیك کردووە، توانی لە میانەی ئەزموونی تایبەتی خۆی و لەسەر دەستی "کلانبۆی"، کە یەکێك بوو لە مامۆستاکانی خوێندنگەی ئەندازیاری هەندێ لە پرەنسیپە زانستیەکان بەدەستبێنێت. وەك لە پێشەکیەکەیدا دەردەکەوێت، سەید موستەفا لە خوێندنگەی ماتماتیکدا وانەبێژ بووەو یەکێك بووە لەوانەی سەرپەرشتی فێرکردنی سوپای نوێیان کردووە. دوای دەستهەڵگرتن لە بیرۆکەی گەشتکردن بۆ ئەوروپا، باس لە چۆنیەتی پەیوەندیکردنی بە خوێندنگەی نوێوە دەکات، لەم ڕووەوە دەڵێت: "سەلیمی سێیەم بڕیاریدا خوێندنگەیەکی گەورەو نوێ لە نزیك جبەخانەکە لە "سدلیزە" بوونیادبنێت، بێگومان پرۆژەی ئەم خوێندنگە کەمێك

دڵگەرمی و کەف و کوڵمی بۆ بیرۆکەی سەفەرکردن بۆ ئەورووپا کەمکردەوە، بیرۆکەی ئەوەی سوود لە نیشتمانی خۆم وەربگرم و بتوانم سوودیشی پێبگەیەنم هۆش و خەیاڵمی برد، ئەوەبوو سەفەرم دواخست. قوتابخانەکە دامەزراو مامۆستاو خوێندکاری هەمیشەیی بۆ دابینکراو حەقی خوێندنیشی دابینکرا، من لە ڕیزی ئەمانەی دوایدا بوم"[1].

لە شوێنێکی تردا باس لە چۆنییەتی فێربوونی زانستەکان و دڵگەرمی بۆ وەرگرتنی مەعاریفی نوێ دەکات:" شەو و ڕۆژ سەردانی مامۆستا تورکەکانم دەکرد، ئەو مامۆستانەی کە بڕێك شارەزاییان لەو زانستانەدا هەبوو، لەوانە کلانبۆی ئیسماعیل ئەفەندی کە لۆگاریتمی بۆم ڕونکردەوە، ئەویش یۆنانیەك فێری کردبوو". بەڵام ئەو زانستانەی موسڵمانەکان لە کۆندا لێهاتوویان تیا دەنواند، ئەمڕۆ ناتوانن شانبەشانی پەرەسەندنە زانستیەکان هەنگاوبنێن: " بەڵام نووسینە سەرنج ڕاکێشەکان و ئەو کەرەستانەی لە هەندێ لە هەرێمەکانی ئەورووپاوە دێن، بوارێك ناهێڵنەوە بۆ گومان، کە ئەو سەنتەرەی ئەم زانستانەی تیا هەیە یەکگرتوو زیندون.. هەر بۆیە بیرۆکەی نزیکبوونەوە لەم سەنتەرە لە ناخمدا گەڵاڵەبوو، بەبێ کات بەفیڕۆدان، خۆمم تەرخانکرد بۆ خوێندنی زمانی فەڕەنسی وەك جیهانیترین زمانەکان، کە دەیتوانی لە ناسینی ئەوانیتر، ئەوانەی لەسەر ئەم هونەرە نایابانەیان نووسیوە، نزیکمخاتەوە"[2].

سیحرو ڕەونەقی زانستە نوێکان، بەرامبەر بەوەش دواکەوتوویی ئەم مەسەلە لە ئەستەمبوڵ، سەید موستەفای بۆ خوێندنەوەی نووسینی زاناکانی ئەورووپا هاندا: " ئەو ئارەزووەی خووم

---

[1] سید مصطفى: نقد حالة الفن العسكري. ص٥٨

[2] هەمان سەرچاوە، ل٥٨.

پێوەگرتبوو، خێرا لە ئامانجەکەمی نزیکخستمەوە، لە ماوەیەکی کورتدا خۆمم لە دۆخێکدا بینیەوە کە تیایدا دەمتوانی کتێبەکانی وۆلف (Wolf) و ئۆزنام (Ozanam) و بلیدۆر (Belidor) و ژمارەیەکی تر لەم جۆرە نووسەرانە بخوێنمەوە"[1].

قوڵبوونەوەی سەید موستەفا لە خوێندنەوەی کتێب و نووسینی فەرەنسیدا بووە هۆی پێکهێنانی میتۆدێکی نوێ و دۆزینەوەی چەندین بەهای تر. لە سەرەتای کتێبەکەیدا گومان دەخاتەسەر بیرکردنەوەی باوی عوسمانی سەبارەت بە سروشتی ئادەمیزاد لە فێربوون و وەرگرتنی زانستەکاندا، لە کاتێکدا کۆنەپارێزەکان لە ئەستەمبوڵ بڕوایان وابو فێربوون وەرگرتنی مەعریفە پێویستە لەڕێگەی پێشینانەوە بێت، کە ئەوانیش لە نەوەکانی پێش خۆیانەوە وەریانگرتووە، سەید موستەفا تێڕوانینیی وابوو ئەوە ڕاست نییە، چونکە دەتوانین خۆڕسکانە پێیبگەین. لەم ڕووەوە نموونەشمان پێدەدات: "ئایا پێچەوانەکەیمان نەدیتووە؟ ئایا ناکرێ باسکال-ی ناودار بکەینە نموونە؟ کە چۆن توانی بێ هیچ هاوکاریەك لە تەمەنێکی تا ڕادەیەك زوودا بگاتە داهێنان، چۆن توانی بگاتە هەر سی و دوو وانەکەی ئیقلیدس و بە شێوازی تایبەتی خۆی بیانسەلمێنێت؟"[2].

ئامانج لە هێنانەوەی ئەم نموونە هەوڵدانێکە بۆ ڕزگاربوون لە قورسایی داب و نەریتە باوەکانی ئەستەمبوڵ، هەروەها هەوڵێك بو بۆ دابڕان لەگەڵیاندا. بەدیوێکی تردا هێنانەوەی باسکال بە نموونە مانای ڕاگەیاندنی لایەندۆستی بۆ ڕۆشنبیریەکی نوێ دەگەیاند، کە پلە بە پلەو لەسەرخۆ کاری بۆ دەرخستنی دەکرد.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ل٥٦-٥٧.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

بـەڵام ئامـانجی سـەید موسـتەفا لـە نووسـینی "ڕەخنەکـەی" پیشاندانی کارو پرۆژە چارەسەرسازیەکانی سوڵتان سەلیمی سێیەم و داکـۆکیکردن بـو لێیـان، هـەروەها دەرخسـتنی پێشـکەوتنە بەدەستهاتووەکانی دەوڵەت بوو لە سەردەمی ئەودا. ئامانجێکی تری هێرشکردن بو بۆسەر دوژمنانی ڕیفۆرم و ڕەخنەگرتنیان بە ئاشکرا، بەڵام بە زمانێك کە ئارەزوویان نەدەکرد فێری ببن.

کاتێکیش باس لە کارو دەستکەوتەکانی سەلیمی سێیەم دەکات، لەوانە بوونیادنـانی خوێندنگـەو پێکهێنـانی سـوپای نـویێ، بابەتیانـە باسـیان دەکـاتو قەبارەیـەکی لـە خۆیـان گـەورەتر یـان ناڕاسـتیان پێنادات. بۆ وێنـە لـە کاتێکدا باس لـە کـارو دەسـتکەوتەکان دەکـات لەهەمان کاتدا بەربەستەکانی جێبەجێکردنیان و هەڵویستی نەرێ و ناحەزانەی خەڵکی ڕەشۆکیش دەخاتەڕوو، هەروەها ئاماژەدەکات بۆ ئـارامیی سـوڵتان، کـە چـۆن خـۆی لـە ئامادەکـاریی و ڕێنماییەکانـدا بەشـداریکردووە، سـەید موسـتەفا بـەم شـێوازە بـاس لـە مەسـەلەکان دەکات:

" لـەناو خەڵکـدا دەسـتمان کـرد بـە کـارکردن، یەکـەم جـاربو لـە ئەستەمبوڵ دا خـەڵکی نەخوێندەوار گوێبیستی وانەیەکی گشـتی بـن دەربـارەی بیرکـاری و بەئاشـکرا بەرهـەمی ئەندازەسـازی ببیـنن. لـە هـەمو لایەکـەوە دەنگـی نـەزانی و کڵـۆڵی بـەرزبووەوە، بـەجۆرێك دووچاری پەریشـانی و چەوساندنەوەیان کـردین، هاواریـان دەکـرد: بۆ ئەم هێڵانە دەخەنە سەر کاغەز؟ ئەو سوودانە چین کە بڕواتان وایە پێتانی دەبەخشێت؟ جەنگ بە پرگال (برکار) و هێڵ دروستناکرێت،

هەزار قسەو تێرمی هاوشێوەی تر، کە مەبەستیان بوو ئێمەی پێ زەبون و شەرمەزار بکەن"[1].

ئەو ڕێبازەی کە سەید موستەفا بۆ خستنەڕووی کارو دەستکەوتەکانی سوڵتان بەکاریدێنێت، لەوەی مەحمود ڕەئیف ناچێت، لە کاتێکدا ڕەئیف لە خستنەڕووی تەنزیماتەکاندا تا ڕادەیەك بێدەنگە و شتێك نالێت، کەچی موستەفا ئەزمونەکەی سەلیمی سێیەم دەخاتە نێو چوارچێوە مێژووییەکەیەوە. بۆ پەردەپۆشکردنی وەرگرتن لە ئەوروپاش ئەوە ڕوندەکاتەوە چۆن زانستەکان پاش ئەوەی زادگاکەیان لە شوێنێکی تردا بووە گواستراونەتەوە بۆ ئەم کیشوەرە (ئەوروپا)، وەك چۆن لە ڕابوردودا موسڵمانەکان سەرقافڵەی ژیارو زانست بوون، پێش ئەوانیش میسری فیرعەونەکان و هەروەها یۆنان بووە. پێویستە نادەمارگیری مێژوو لەسەر تاکەکان بە لێبوردەیی ڕەنگبداتەوە، نووسەر بەم شێوەی خوارەوە بیروباوەڕی خۆی ڕوندەکاتەوە:

" گەلانی ناوداری ئەوروپا، کە شانازی دەکەن بە خاوەنداریێتیان بۆ ژمارەیەکی گەورە لە کارە هونەریی و زانستە نایابەکان، خوێندکاری لاتین بوون، ئەوانیش خوێندکاری یۆنانەکان بوون، کۆی ئەمانەش نەیاندەتوانی گومان لە پێشەنگی فارسەکان و میسریەکان و هیندیەکان بکەن... ئەمڕۆش بەهۆی هەمیشە نوێبوونەوەی دۆخی شتەکانەوە مامۆستاکان کە بە لێهاتووی خوێندکارەکانیان سەرسامن، بەداخەوە لەوە زیاتر چاویان لە دەستی ئەوانە، هیچی تر نین"[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٥٩..

[2] هەمان سەرچاوە، ل٦٥.

ڕەخنەشی لەو وەهمە باوانە گرتووە، کە لەسەر هێزو توانای شکستنەخواردووی عوسمانی هەبووە، هۆکاری کەڵەکەبوونی ئەم وەهمانەشی شیکردۆتەوە. سەرەتا عوسمانییەکان بە چەك و تفاقە جەنگیە بەراییەکان و زیرەکی مەزنییانەوە توانییان سەرکەوتن دوای سەرکەوتن تۆماربکەن. بەڵام ئەم سەرکەوتنانە ڕووداوەکانی دەورووبەریانی لەبیربردنەوە، لەوەش زیاتر وایان لێهات گاڵتەیان بە سوپای ڕێکخراو دەهات و بە یاریی منداڵانەیان دادەنا. هەروەها ڕەخنەی خۆی ئاراستەی ئەوانە کردووە کە لە مانەوەی بڕوابوون بەم وەهمانە بەرپرسیارن: " بەم جۆرە ئەو داماوانە توشی وەهمی زاڵبوون بوون بەسەر پرنسیپی بەکارهێنانی چەکێکی هاوشێوەدا بۆ بەرگریکردن، بەکارهێنانی بۆ موسڵمان بووە بە تاوان، ئیدی ئەم بیرۆکە هەڵەیان گشتاند تا ئەو سنوورەی بڕوایان بەوەهێنا کە گەلانی تر بەهەڵەداچوون. بە خراپیش لە تێگەیشتووی و چاوکراوەیی ئەوانیتر، کە داناتر و لێهاتووترن تێگەیشتون"[1].

ڕەخنە لای سەید موستەفا مانای پاراستنی ڕۆحی بابەتیبوونی دەگەیاند، کاتێك ڕەخنە لە دۆخی باو دەگرێت، هەوڵدەدات هۆکارە دوورەکانی ببینێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەگەڕێتەوە سەر مێژووی عوسمانی بۆ ڕاڤەکردنی پاشەکشێ و داتەپینە سەربازی و زانستیەکان. بڕوای وابو لەودیو ئەم پاشەکشێو داتەپینەوە چەندین هۆکاری قووڵ هەبوون، ئەوەندەی لاپەڕەکانی کتێبەکەیشی بواری داون، باسی لێوەکردون.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٦٨.

هەڵبژاردنی زمانی فەڕەنسی لە لایەن نووسەرەوە بۆخۆی مانای بەکارهێنانی شێوازێکی نوێ بوو، ئەو بە تێرم و ڕستەی تەقلیدی دەستپێنەدەکرد، کە نووسینی تورکی پێدەناسرایەوە. کتێبەکەی بە ئاڕاستەکردنی سوپاس و چاکەخوازی بۆ سوڵتان دەستپێناکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ بابەتەکەی دادەڕێژێتەوە، شتێکی سروشتی بوو بەکارهێنانی زمانی فەڕەنسی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ڕێبازی باوو پەیڕەوکراوی نووسینی هەڵوەشاندەوە، لەوانە هێنانەوەی ئایەتەکانی قورئان و دێڕە شیعرییە عەرەبی و فارسیەکان. زمانی فەڕەنسی بەکارهێنانی تێرم و زاراوە نوێکانی ئاسانکرد، ئەوانەی وەرگێڕانیان بۆ تورکی لەلایەن نووسەرەوە سەختبوو. زۆربەی ئەو تێرم وزاراوانەی بەکاریدەهێنان سەر بە بوارەکانی زانست و ماتماتیک بوون. یەکێك لەو وشانەی لای ئەم زۆر دوبارەدەبنەوە تێرمی (Tactique)، کە هێمایە بۆ زیاد لە مانایەك، لای نووسەر ئەم تێرمە بە مانای دیسپلین و هونەری سەربازی دەهات. هەرچی زاراوەکانی ترە کە بەکاریدەهێنا لەوانە: Typographie و Mecanique.

گرنگتر لەوانە بەکارهێنانی بوو بۆ دوو زاراوەی نوێ، کە لەو کاتەدا لە سنوورێکی بەرتەسکدا نەبێت لە ئەستەمبوڵ بەکارهێنراون، یەکەمیان Revolution بوو کاتێك دەڵێت: "... با خشتەیەك ئامادەبکەم بۆ دۆخی ڕابوردوی هونەری سەربازی و ئەندازە لەم وڵاتەداو "شۆڕشی شادی"[1] کە لە ماوەیەکی کورتدا هێنایەئارا". زاراوەکەی تر بریتیبو لە patrie کە دوو جار بەکاری هێناوە یەکێکیان لە کۆتایی کتێبەکەیدا: " بۆخۆم لە خۆشیدا سەرخۆشم بە بینینی –نیشتمانەکەم– لەو ڕەوشەدا، کە بە گەرمی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

ئاواتی بۆ دەخوازم. هەمیشە گەشاوەیە و بەتایبەتیش بە مەشخەڵی زانست و هونەرەکان"[1].

## ڕۆڵی زمانی فەرنسی

بەکارهێنانی زمانی فەڕەنسی یان وەرگێڕان لە فەڕەنسیەوە بۆ توركی ڕۆڵێكی سەرەكی لە پەرەسەندنی زمانی توركیدا گێڕاوە لە میانەی تێكهەڵكێشكردنی تێرم و وشە ئەوروپیەكان لەگەڵ زمانی توركیدا. لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین كە كاریگەری زمانی فارسی و عەرەبی لە كۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا بە تەواوی پاشەكشێی نەكرد. لە ماوەی سەردەمی سەلیمی سێیەم دا عاسم ئەفەندی[2] فەرهەنگێكی لەژێر ناونیشانی "بەڵگەی ڕەها" لە زمانی فارسیەوە بۆ زمانی توركی وەرگێڕا[3]. هەروەها لە قۆناغێكی دواتردا فەرهەنگێكی لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێڕاوە. ناوبراو وێڕای ئەوەی لە فەڕەنسیدا لێهاتوبو، بەڵام لە فارسی و عەرەبیشدا شارەزایی هەبووە. بەكارهێنانی زمانی فەڕەنسی بەرفراوانتر دەبوو.

یەكێك لەوەرگێڕەكان لە زمانی فەڕەنسیەوە بۆ توركی خۆجە ئیسحاق[4] بوو، كە بە بنەچە جولەكە بوو، لە خوێندنگەی ئەندازە مامۆستابوو، چەندین كتێبی لە بوارەكانی سەربازی و ماتماتیكدا وەرگێڕابوو. لەم بابەتەی دواییاندا كۆمەڵێك وانەی ئامادەكردبوو. هەروەها كتێبێكی سەبارەت دانانی چادرو ڕەشماڵ (خیام) و بنەماكانی مەحكەمكردن (اصول الاستحكامات)، و كتێبێكی تر

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٨٨.

[2] المصري. حسين مجيب. فی الادب التركي، ص٣٦٨.

[3] برهان قاطع، قاموس للايرانی محمد حسين التبريزي، كتبه عام ١٦٥٢.

[4] المصري. حسين مجيب. فی الادب التركي، ص٣٦٩.

سەبارەت بە پێچەوانەی ئاوێنەکان وەرگێڕاوە. ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە ناساندنی قوتابییەکان بە بایەخ و گرنگی زانستەکانی ئەوروپا: "خۆجە ئیسحاق لە ئامادەکردنی وانەکانیدا سوودی لە کتێبە بیانییەکان وەردەگرت. قوتابییەکانی تێرم و ڕستەی زۆریان لێوەردەگرت کە بە زمانەکەی خۆیان نامۆ بوو، هەروەها تێگەیشتن کە کتێبە ئەوروپییەکان گەنجینەی زانستن، ئەگەریش شارەزایی لە زمانەکانیاندا پەیدابکەن ئەوا کلیلەکانی لە دەستەکانی ئەماندا دەبن..." [1].

وەرگێڕێکی تر لە وەرگێڕەکانی قۆناغی سەلیمی سێیەم، بەهجەت موستەفا بوو[2]، کە لە سالی (١٨٢٢ز)دا مردووە، لە پزیشکیدا پسپۆڕبوو. کتێبێکی لە فەرەنسییەوە لە سەر مێژووی سروشتی وەرگێڕاوە هەروەها بەسوودوەرگرتن لە خوێندنەوەکانی بە زمانی فەرەنسی چەندین کتێبی لە بوارەکانی مێژووی زانستەکان و پزیشکیدا نووسیوە، لەم بوارەدا ڕۆلی عەلائەللا شانی زادە، کە لە سالی (١٨٢٦ز)دا مردووە هاوشێوەی ڕۆلی بەهجەت موستەفا بو، عەلائەللا لە بواری پزیشکی هەروەها لە بواری مێژوو و ماتماتیکدا نوسیویتی، زمانەکانی لاتینی و فەرەنسی و ئیتالی زانیوە، بۆ نووسینی کتێبەکانی لە بواری پزیشکیدا سوودی لە سەرچاوە ئەوروپییە جیاوازەکان وەرگرتووە: کتێبە سەرەکییەکەی بەناونیشانی "ئاوێنەی جەستەکان لە توێکاری ئەندامەکانی ئینسان". گرنگی و بایەخی کتێبەکەی دەگەڕایەوە بۆ کورتکردنەوەی بۆ ئەو تیۆریانەی سەدەی هەژدەهەم، کە تایبەتبوون بە زانستی توێکاری و پزیشکی هەناو چالاکی ئەندامەکان، هەروەها بۆ بەکارهێنانی بۆ تێرمە

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٣٧٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٣٧١.

پزیشکییه نوێکان و بۆ یەکەمجار هێنانی بۆ ناو زمانی تورکی.
هەروەها عەلائەڵلاّ کتێبێکی لە زمانی ئیتالیەوە[1] وەرگێڕاوەو ناونیشانی (پێوەری پزیشکەکان)ی بۆ داناوە[2].

ڕۆڵی ئەم وەرگێڕانە لە پێشخستنی بزاڤی نوێگەری فیکریدا کاریگەربوو. لە واقیعدا ئەوان ئاقارێکیان بوونیادنا،کە زۆری پێنەچوو، پاش چەند ساڵێکی کەم پەرەیسەند، زۆری نەبرد لە ئەستەمبوڵ دا زمانی فەڕەنسی پێگەیەکی جێگیرو سەقامگیری پەیداکرد، بە جۆرێك لە سەردەمی مەحمودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩ن)دا لە ئەستەمبوڵ یەکەم ڕۆژنامە بە هەردوو زمانی تورکی و فەڕەنسی دادەمەزرێ. و لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا سوڵتان عەبدولمەجید (١٨٣٩-١٨٦١ن) فەڕەنسی دەزانی[3].

[1] -Medizinisch –prak lacher Unterricht.

[2] سەبارەت بە عەلائەڵلاّ و کتێبەکانی کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فەڕەنسی بڕوانە:
Adnan, A:la science chez les turcs.. P.159

[3] المصري. حسين مجيب. في الادب التركي، ص٢٧٤.

گرنگترین کاریگەری لەو ماوە کورتەی حوکمڕانی سەلیمی سێیەمدا کە ئەستەمبولێ بەخۆوەبینی، بڵاوبوونەوەی چەمکە نوێکان بوو، کە بە چەندین تێرم و زاراوەی دیاریکراو گوزارشتی لێدەکرا. دیتمان چۆن تێرم و زاراوە زانستیەکان لە بوارە زانستییە جیاوازەکاندا لای ڕۆشنگەرە عوسمانییەکان ناسراوبوون. ئەوەیشمان دیت فەرەنسیزانەکان هەندێ چەمکی سیاسییان بەکارهێنا، چونکە شارەزابوونیان لە زمانێکی ئەوروپی بواری ئەم بەکارهێنانەی پێدان، بەڵام گرنگترین پەرەسەندن بڵاوبوونەوەی چەندین چەمکی نوێ و بەخشینی ناوەڕۆکی نوێ و نامۆ بوو بەهەندێ لە چەمکە تەقلیدییەکان.

چەمکە نوێکان

چەمکی "نیشتمان"، کە سەید موستەفا لە کتێبەکەیدا[1] بەکاریهێناوە، پێشتر لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا کە ئاشنابوون بە چەمکەکانی "ئوممە" یا "میللەت"، ناسراو نەبوو. هەردوو ئەم تێرمەش بۆ هێماکردن بۆ کۆی موسڵمانەکان بێ جیاوازی لە ڕەگەز یان ئایین بەکاردەهێنران، لە هەمان کاتدا چەمکی "دەوڵەت" گوزارشت بوو لە قەوارەی سیاسی موسڵمانەکان. بەڵام چەمکی "نیشتمان" هێما بو بۆ شوێنی لەدایکبوون و تا سەردەمانێکی درەنگی سەدەی نۆزدەهەمیش مانای "Patrie" ی وەرنەگرت[2].

---

١

[2] Ruphy: Dictionnaire abree, paris, 1802 P185

بەلام چەمکی "شۆرش:Revolution" لە ئەدەبی سیاسی ئیسلامیدا دەلالەتێکی نەرێنی هەبو. شۆرش لەگەڵ فیتنەدا یەکسان بوو، واتا دەبووە مایەی ئاژاوە و یەکترکوشتن، هەمیشە وتراوە"سوڵتانێکی ستەمکارو زۆردار نەك ئاژاوەیەکی بەردەوام و درێژەدار".

لە واقیعدا نووسەرەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم هەمان تێروانینی تەقلیدییان بۆ شۆرشی فەرەنسی هەبووە. نیقۆلا تورك وەك "ئاژاوەیەکی مەزن" بینیویێتی، سەید وەحید ئەفەندی باڵوێزیش لە پاریسدا وەك "پشێوییەك" تەماشایکردووە. دەستەواژەی "Revolution" تا سەردەمانێکی درەنگ مانای نوێی خۆی وەرنەگرت، ئیتر تاویێ بۆ شۆرش و تاویێ بۆ کودەتا بەکاردەهێنران[1]. لەواقعیدا ئەو مانایانەی شۆرش[2] دەیبەخشین لە نێو چەمکی تردا کە ئەویش چەمکی "ریفۆرم"[3] بوو، رەنگیداوەتەوە. هەرچی چەمکی گۆرانی شۆرشگێرانە بوو، کە لەگەڵ ئەزمونی فەرەنسیدا دەرکەوت، ئەوا لەسالآنی دوایی سەدەی هەژدەهەمدا لای عوسمانییەکان بو بە چەمکێك بۆ گۆرانکاری چارەسەرسازییانە.

دەستەواژەی ریفۆرم لای موسڵمانەکان مانایەکی ئایینی پەتی هەبوو، لای فوقەهاکانیش ریفۆرم بەگەرانەوە بۆ پێشینان یان بۆ سەرچاوە ئیسلامیەکان، بەتایبەتیش بۆ قورئان دروستدەکرا. بەلام لەگەڵ حاجی خەلیفەدا تێرمی ریفۆرم مانا ئاینیەکەی تێپەراند تا ئەو سنوورەی مەسەلە کۆمەلآیەتی و سیاسیەکانیشی دەگرتەوە

---

١

٢

3 - Merad, F: art. Islah Ei2 Vol. 4, PP 146-170

بەتایبەت لە نامەکەیدا لە ساڵی (١٦٥٣ن)دا "دەستوری کار بۆ چارەسەرکردنی دۆخی نالەبار". بزاڤی پەیوەندی لە نێوان عوسمانییەکان و ئەورووپادا لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا مانایەکی نوێی بەخشیە چەمکی ڕیفۆرم. بەجۆرێك بزاڤی ڕیفۆرم زۆر بواری دەگرتەوە لەوانە: زانستەکان و کارگێڕی و سوپا، لەگەڵ سوڵتان سەلیمی سێیەمدا ئیدی چەمکی ڕیفۆرم بوو بە بەرنامەیەکی سیاسی[1].

زاڵبوون و سەرکەوتنی چەمکی ڕیفۆرم بەسەر هەموو بیرۆکەی گۆڕانێکی توندوتیژدا زۆر هۆکاری هەبوو، پرۆژەی ڕیفۆرم هەر لە سەرەتاوە پرۆژەی خودی سوڵتانەکان بوو، کە بۆ پاڵپشتکردنی دەسەلاتیان و سنووردانان بۆ هەژمونی ئینکیشاریەکان دەیانویست چەند هەنگاوێکی چارەسەرسازییانە بنێن، لێرەوە ئەو سوڵتانانەی کە ڕێبەرایەتی بزاڤی ڕیفۆرمیان دەکردو دنەیاندەدا، لە هەمان کاتدا نەیاری هەموو ئاڕاستەیەك بوون کە مەترسی بۆ پێگەکەیان دروستبکات. سەرباری ئەمە چەمکی ڕیفۆرم لەلایەن هەندێ لە ڕۆشنگەراکانی نزیکی سوڵتانەوە ئەوانەی هەڵگری بیروباوەڕی گۆڕانکاری ڕادیکاڵانە نەبوون، قۆرخکرابوو[2].

سەبارەت بە چەمکەکانی تری وەك: سەربەخۆیی و کۆماری و ئازادی، عوسمانییەکان پێی ئاشنابوون و هەوڵیاندا لە زمانەکەی خۆیاندا هاوکێشەیەکی پێبدەن، ئاگاداربوون و ناسینی ئەم چەمکانە بەلایەن کەمەوە لە قۆناغە بەراییەکاندا لە ڕێگەی بەسەرکردنەوەی بەرهەمەکانی نووسەرو بیرمەندە فەرەنسیەکان یا ئەوانیترەوە نەبوو، ئەوەندی لە ئاکامی بەشداری و پەیوەندیەکانەوە بوو لەگەڵ دۆخی

---

[1] Berkes, N: art. Islah Ei2, Vol,4 PP.174-177

[2] Hurat,Cart Kucuk kaynardja Ei1,Vol 2.p. 1156

سیاسی ولأتانی ئەورووپا، هەروەها لە ئاکامی ئەو گۆڕانکاریانەوە بوو، کە خودی ڕووداوەکان سەپاندبوویان[1].

یەکەمین دەقی تورکی، کە چەمکی ئەورووپی نوێی بەکارهێنابێت، دەقی پەیماننامەی " کوچك کاینارچی: Kucuk Kaynardja" نێوان تورکیاو ڕووسیا بوو لە ساڵی (١٧٧٤ز)دا. لە دەقی ئەم پەیماننامەدا تێرمی "سەربەخۆیی" بەکارهاتووە کە هێمایە بۆ جیابوونەوەی هەرێمێك یان گەلێك، لە پەیماننامەکەشدا وەك ئاماژەیەك بۆ ئەودەستکەوتانەی بەخشراونەتە حکومەتێکی ئازاد لە ناکۆکیدا لەگەڵ دەسەلأتێکی ڕەها بەکارهاتووە. ئیدی لەژێر کاریگەری فیکرو کاری سیاسیدا لە ئەورووپا، تێرمی سەربەخۆیی مانای سەروەری سیاسی ولأتێك یان نەتەوەیەکی وەرگرت، پەیماننامەکەش بەم مانایە تێرمەکەی بەکارهێناوە[2].

چەمکێکی تر کە ڕۆشنگەرە عوسمانییەکان پێی ئاشنابوون و دوای شۆڕشی فەڕەنسی و لەژێر کارتێکردنی ئەم شۆڕشەدا هاتۆتە ئەستەمبوڵ، چەمکی "کۆماری" بو، تێرمەکە لە بنەڕەتدا عەرەبیە و لە وشەی "جەماوەر" وە هاتووە کە ئاماژەیە بۆ گروپێك یان دەستەیەك لە خەڵکی، تێرمی "کۆماری" لای بیرمەندە عەرەبەکان و لە سەردەمە کلاسیکیەکاندا و بەتایبەت لای فەیلەسوفەکانی وەك فارابی و ئەوانیتر کە لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا پەیوەندییان هەبووە، ناسراوبوو. لەگەڵ ئەوەی تێرمەکە بەکارهێنانەکانی کەم بوبووەوە، بەلأم شۆڕشی فەڕەنسی جارێکی تر لە بازنەی ئیسلامیدا هێنایەوە

---

1 Ruphy : Dictionnaire abrege…P.108

٢ هەروەها بڕوانە:

Vatikioties P. J.art. Istiklal Ei2. Vol. 4 PP272-275

بیرو خەیاڵ، ئاماژەیەکیش بوو بۆ سێستمی سیاسی لە فەڕەنسا و وڵاتەکانی تردا[1].

لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا ئاماژە بۆ تێرمی "کۆماری" کراوە، عاتیف ئەفەندی لە یاداشتەکانیدا لە ساڵی (١٧٩٨ن)دا، لە چوارچێوەی قسەکردنیدا لەسەر دۆخی سیاسی لە فەڕەنسا[2] باسی لە یەکسانی و کۆماری کردووە، لە ساڵی (١٧٩٩ن)یش بۆ وەسفکردنی سیستمی سیاسی لە " جزایر سبعة مجتمعة جمهور"دا تێرمەکەی بەکاریهێناوە، هەروەها لە نامەکانی خالید ئەفەندی-باڵوێزدا لە پاریس بەکارهاتووە[3].

تورکە عوسمانییەکان لە بەکارهێنانی تێرمی "کۆماری"دا دەستپێشخەربوون، لە ئەستەمبوڵ-یشەوە بە تەواوی وڵاتە ئیسلامیەکاندا بڵاوبووەوە. لە میسردا بۆ ئاماژەکردن بۆ ئەو سیستمە سیاسیەی لە فەڕەنسادا هەبوو، تێرمی کۆماری بەکارنەدەهێنرا، بەڵکو تێرمی "شێخنشین"یان[4] بەکاردەهێنا کە لە ڕاگەیاندنەکانی پۆناپەرتدا بۆ گەلی میسر پاش هەڵمەتەکەی فەڕەنسا لە ساڵی (١٧٩٨ن)دا هاتووە. هەروەها نیقۆلا تورک لە چوارچێوەی باسکردنەکانی سەبارەت بەدەوڵەتی فەڕەنسی بەکاریهێناوە: "هەر لایەنێك دان بە شێخنشینەکەماندا بنێت ئەوا دۆستمانە، هەر لایەنێکیش دانی پێدانەنێت ئەوا دوژمنمانە..."[5]، لێرەدا تێرمی شێخنشین لە وشەی "شێخ" وە هاتووە، هەڵگری جۆرێك لە

---

[1] Lewis. B:art. Djumhuriya Ei2,Vol.2pp.608-611.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٦٠٨.

[3] هەمان سەرچاوە، ل٦٠٩.

[4] هەمان سەرچاوە، ل٦٠٩.

[5] الشهابي: تاريخ الامراء الشهابيين. الجزء الاول، ص٢٣٥.

نزیکایەتییە لە نێوان سیستەمەکەی فەڕەنسا پاش شۆڕش و لە نێوان سیستەمەکەی مەدینەدا لە پاش مردنی موحەممەدی پێغەمبەر(د.خ). بەڵام جەبرتی بۆ وەسفکردنی سیستەمە سیاسیەکەی فەڕەنسا تێرمی "جەماوەر" و تێرمی "ئەنجومەن"ی بە هەمان مانا بەکارهێناوە، دەڵێت: "ئەم نامەیە لە لایەن جەماوەری ئەوانەوە واتە ئەنجومەنەکەیان نێردراوە، چونکە ئەوان نە گەورەیان هەیەو نە سوڵتان..."[1] لەگەڵ ئەوەشدا تێرمی کۆماری لە میانەی تورکەکانەوە بۆ وڵاتە عەرەبیەکان دەگوێزرێتەوەو دواتر پێ بە پێ هەمان مانای وشەی "Republique"ی فەڕەنسی وەردەگرێت.

چەمکی ئازادی، کە شۆڕشی فەڕەنسی بەرزیکردبووەوەو کردبوویە یەکەمین دروشمی سێگۆشەیی خۆی، کە مانای ئازادی تاك و ئازادی نەتەوەی دەگەیاند، تێرمێك بو موسڵمانەکان پێی ئاشنا نەبوون، وشەی ئازادی کە دواتر بەرامبەر وشەی "Liberte"ی فەڕەنسی بەکارهێنرا، وەك بەرامبەرێك بۆ تێرمی "کۆیلە" بەکاردەهێنرا. هەروەها تێرمی ئازادی ئاماژەبو بۆ بنەچە یا خانەدانی، مرۆڤی ئازاد خانەدان و نەجیبزادەیە و ئازادەکان ڕەگەز و بنەچەیان هەیە؛ لای ئەهلی تەسەوفیش ئازادی بریتیبوو لە بەندایەتی و کۆیلەیەتی تەواوەتی بۆ خواوەند[2]. تا ناوەڕاستەکانی سەدەی هەشتەمیش هیچ گۆڕانێك بەسەر چەمکی ئازادیدا نەهاتبو لە ئیسلامدا، تەهانوی لە فەرهەنگەکەی" دۆزەرەوەی تێرم و زاراوەی هونەرەکان"دا، ئەم ڕاڤەیە بۆ ئازادی دەکات: " لە بەرامبەر کەسی ئازاددا کۆیلە هەیە.. لای پەیڕەوکاران ئازادی بڕینی ویژدان و خەیاڵە لە خووگرتن بەهەر شتێکەوە، خودای مەزن نەبێت... ئازادی

---

[1] الجبرتي، تاريخ مدة الفرنسيين في مصر، ص١٢.

[2] بڕوانە: روزنتال. فرانز: مفهوم الحرية في الاسلام، معهد الانماء العربي-بيروت ١٩٧٩.

کۆتـایی بەندایـەتی و کۆیلەیەتیـە، ئاسـوودەیی ئـادەمیزادە پـاش دەستپێکردنی ژیانی"[1].

بـەڵام لـە سـاڵی (١٧٧٤ز)دا و بـەدیاریکراوی لـە چوارچـێوەی پەیماننامـەی کوچـك کینارچـی (گوندێکـە لـە باشـوری دانـوب لـە بولگاریـا.و.)دا بـۆ بەخشـینی مانـای "Liberte"ی تێرمێکـی تـورکی بـەکارهێنراوەو وشـەی ئـازادی بەکارنـەهێنراوە، بـەڵکو وشـەی "سربسـتیە"، کـە لـە تورکیـدا مانـای نـەمانی سـنووری کـۆت و بەنـد دەگەیەنێت، لە چوارچێوەی ئەم پەیماننامەدا وشەی "سربستیە" بۆ ئاماژەکردن بۆ ئازادی دەستەجەمعی و سیاسی بەکارهێنراوە[2].

یەکەمین ئەو کەسانەی سەرنجیان ڕۆیشت بۆ ئەو مانایانـەی کـە چەمکی "ئازادی:Liberte" هەڵگری بوو، باڵوێزو دیپلۆماتە تورکەکان بوو، یەکێك لەوانە مورلی سەید ئەفەندی بوو، کە لە ڕاپۆرتەکانیدا وشەی "سربستیە"ی بەکارهێناوە، بە هەمان شێوە خالید ئەفەندی، کە باس لە ئازادی و کۆماری دەکات. عاتف ئەفەندیش هـەمان کاری کردووە کاتێك باس لە دۆخی سیاسی دەکات لە پاریسدا، هێمای بۆ ئـەوەکردووە کـە پیـاوانی شـۆڕش بـەڵێنی ئـازادی و یەکسـانی "Musawat we Serbestiyyet" یان بە خـەڵکی ڕەشـۆك "Le menu people" داوە[3].

لە میسریشدا کە ساڵی (١٧٩٨ز) لە کاتی هێرشەکەی پۆناپەرتدا هـەرێمێکی عوسمـانی بـوو، چـەمکی ئـازادی لـە میانـەی ئـەو ڕاگەیاندنـەی پۆناپـەرت ئاڕاسـتەی گـەلی میسـری کـرد بـە مانـا

---

١

2 Lewis. B:art Hurria… Ei2,Vol.3 PP601-615.

٣ هەمان سەرچاوە، ل٦١٠.

نوێیەکەی ناسرا، کە هاتووە: "لە جەماوەری فەڕەنساوە، کە لەسەر بناغەی ئازادی و یەکسانی بوونیادنراوە"[1].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، چەمکی ئازادی بەمانا نوێیەکەی تا ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بە ناڕونی مایەوەو ناکۆکی لە نێوان هەردوو تێرمی "ئازادی" و "سەربەستی" هەر بەردەوام بوو، لە کاتێکدا وشەی ئازادی پێچەوانەی بەندایەتی و کۆیلەیەتی دەگەیاند، وشەی سەربەستی مانای ئازادی سیاسی و سەربەخۆیی دەبەخشی. بەڵام پەرەسەندنی پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەورووپاو پلە بە پلە تێگەیشتن لە چەمکەکانی شۆڕشی فەڕەنسی بواری کردەوە بۆ وشەی "ئازادی" تا هەمان مانای "Liberte"ی فەڕەنسی وەربگرێت. ئەوکات لە چەمکێکی پەتییەوە وەرگێڕدرا بۆ هێزێکی سیاسی ئەکتیڤ.

لە چوارچێوەی تێگەیشتن لە چەمکە نوێکان، دەکرێ ئاماژە بۆ چەمکگەلی تر بکەین، کە بەهۆی ئاشنایەتیان لەگەڵ بیرکردنەوەی ئیسلامیدا، دەرکەوتنیان سەدایەکی گەورەیان دروست نەکرد، لەوانە چەمکی "برایەتی" وەك دەزانین ئیسلام جەخت لە پاڵپشتی و هاریکاری برایەتی لە نێوان موسڵمانەکاندا دەکاتەوە: "انما المؤمنون اخوة". هەروەها دەبوو چاوەڕێی گەردگیربوونی چەمکی نیشتمان بکرێت تا برایەتیەکی نوێ کە پایەکانی لەسەر لایەندۆستی بۆ نیشتمان نەك لایەندۆستی ئایین وەستابێت جێگەی بگرێتەوە. هەروەها "یەکسانی" کە لە هەناوی بیرکردنەوەی ئیسلامیدا بوو "جیاوازی لە نێوان عەرەبێك و عەجەمێکدا نییە، تەنیا خواپەرستی نەبێت". شایەنی وتنە لە ڕاگەیاندنەکانیاندا بۆ موسڵمانەکان

---

[1] بڕوانە دەقی ڕاگەیاندنەکە لە: خوری، رئیف: الفکر العربی الحدیث، بیروت دار المکشوف ١٩٤٣ ص١٧١.

فەرەنسیەکان جەختیان لەسەر برایەتی و یەکسانی دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەستەمبوڵ دا لە دژی ئەم چەمکانە پەرچە کردار دەرکەوتن، ئەو کاتەی لای هەندێك دیپلۆمات و کاربەدەستی عوسمانی ئەوە ئاشکرابو، کە ئەو چەمکانە هەڵگری ئامانجگەلێکی سیاسی مەترسیدارن بۆ سەر خودی قەوارەی سیاسی دەوڵەت.

## پەرچە کردار

ئەگەر چەمك و بیروباوەڕە فەرەنسیەکان سەدایەکیان لە ئەستەمبوڵ و لەناو بازنەی عوسمانیدا بەگشتی هەبوبێت، ئەوا ژمارەی ئەوانەی ئەم بیروباوەڕو چەمکانە مەترسیی وروژاندن گەورەو کاریگەربوون. ئەگەر هەندێ لە ڕۆشنگەرە دڵگەرمەکان بڕوایان بەوە هەبوو تێکهەڵکێشکردنی زانستەکانی ڕۆژئاواو مەعاریفەکانی لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا کارێکی گونجاوەو داخوازییەکانی دۆخەکە دەیسەپێنێت، ئەوا ئەم جۆرە قەناعەتە کۆدەنگیەکی نەخوڵقاند، چونکە دەستەگەلێکی کاریگەر بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ ئەم کرانەوەدا بەڕوی زانستەکانی ئەوروپاو ڕۆشنبیری فەرەنسیدا بەتایبەت ناکۆك بوو. لەوانە سەرانی سوپای ئینکیشاری کە پێیان وابوو پێکهێنانی سوپای نوێ مەترسیە بۆسەر قەوارەی ئەوان، کە ئەوە مەترسییەك بوو لە جێگەی خۆیدا، هەمان شت سەبارەت بە پیاوانی ئایینی، کە خاوەن پێگەو قەبارەی خۆیان بوون، ترسی ئەمان لە بیروباوەڕە باوەکان بوو. ئەمانەی لێدەرکەیت، هەندێ لە کاربەدەستانی کارگێڕییەکەی سەلیمی سێیەم لە کرانەوەدا مەترسییان بۆ سەر قەوارەی دەوڵەت دەبینی.

هـەر لـە سـەرەتاوە زۆرینـەی عوسمانییـەکان وەك ڕووداوێکـی نـاوخۆی فەڕەنسـی تەماشـای شۆڕشـی فەڕەنسـییان کـردو لـە سنووڕێکی کەمدا نـەبێ ڕەچاوی ئاکامـە جیهانیـەکانی ئەم ڕووداوە مەزنەیان نەکرد، کاتێکیش ئەم شۆڕشـە بـوو بە سەرچاوەی نـاکۆکی لـە نێـوان وڵاتـانی ئەورووپیـداو بـوو بەنموونەیـەك بۆ لاسایکردنەوە، عوسمانییـەکان وایـان دانـابوو ئـەم نموونـە پەرەسـەندنانە، کـە بـە ئـەورووپادا بڵاوبوونەتـەوە، کاریگـەری نابێـت بۆسـەر ئـەوان، سـەرقاڵبوونی ئەورووپیـەکانیش بـە جەنگـە ناوخۆییەکانـەوە بـۆ ئەستەمبوڵ سەرچاوەی ئاسـوودەگی بـوو، یـەکێك لـە هاوکارەکـانی سوڵتان ئەمەی ئاشکراکردووە ئەحمەد ئەفەندی لە یاداشتەکانیدا لـە سـاڵی (١٧٩٢ز) لـە چوارچـێوەی قسـەکانیدا سـەبارەت بـە گرنگیدانی ڕووسیا بە داگیرکردنی پۆڵۆنیاو خەریکبوونی ئینگلتەرا بە گێڕانەوەی پاشایەتی بۆ فەڕەنسا ئاواتەخوازە ئەم ئاژاوە ئەورووپا بگرێتـەوە بـۆ ئـەوەی نەیانپەرژێتـە سـەر دژایـەتیکردنی دەوڵـەتی عوسمانی[1].

لە سێدارەدانی لویسی شانزە، کە پێشتر خۆی و سەلیمی سێیەم نامـەیان پێکـەوە ئـاڵوگۆڕکردبوو، لـە ئەسـتەمبوڵ دا بـەجۆرێك لـە خۆپارێزییـەوە پێشـوازی کـرا، بـەڵام فەڕەنسـیەکان لای خۆیانـەوە تێڕوانینیـان وانـەبو ئـەو کـردارە لـە مەودایـەکی دووردا ناوبـانگ و وێنایان لای عوسمانییەکان بشێوێنێت، یەکێك لە پیاوانی کارگێڕی فەڕەنسی بەم شێوە نـاڕوونی هەڵوێستەکە دەرئەبڕێ کاتێك دەڵێت: ئەگەرچی لـە سێدارەدانی پاشـا کاریگەرییـەکی خراپـی لای چینی حوکمڕانی عوسمانی بەجێهێشتووە، بەڵام نێردراوەکانی شۆڕش لای

---

[1] Lewis. B: The impact of French.. P.119

بابیعالی جەخت لە ڕوویەکی تر دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە فەڕەنسا دوای پەیڕەوکردنی ئایینی عەقڵ ئیدی لە پێگەیەکی ناکۆکدا نین لەگەڵ موسڵمانەکان[1].

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە بەرپرسە عوسمانییەکان قەناعەتیان بەم جۆرە دڵنیاکردنەوانە نەبوو، و دوژمنایەتی ئاشکرای خۆیان پیشانداو مەترسی خۆیان لە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکانی ئازادی و یەکسانی بیروباوەرەکانی تر نەشاردەوە. عاتیف ئەفەندی ئەمەی دەربڕیوە، کە دیدگای وابو پیاوانی شۆڕش خەڵکی خراپەکار هاندەدەن شوێنیان بکەون و بەڵێنی یەکسانی و ئازادییان پێدەدەن، خالد ئەفەندی نوێنەری سەلیمی سێیەم لە پاریس لەساڵی (١٨٠٢ن)، کە یەکێك بوو لەو کۆنەپارێزانەی بە ناحەزیی بۆ فەڕەنسا ناسرابوو، هەمان هەڵوێستی دەربڕیوە. یاداشتنامەیەکی درێژی بەرزکردۆتەوە تیایدا ڕقی خۆی بەرامبەر فەڕەنسیەکان و سیستەمە سیاسیەکەیان خستووەتەڕو، دەڵێت:

"فەڕەنسیەکان هەوڵیاندا خۆیان وەك موسڵمانی ڕاستەقینە پیشانبدەن، بۆ ئەوەی سۆزی خەڵکە سادەکە بۆ خۆیان ڕابکێشن، بانگەشەی ئەوەیان کرد کڵێساکانیان وێران و تەختکردووە. بەڵام کە زانییان ئەم بانگەشە ئامانجەکانیان جێبەجێ ناکات، دەستیانکرد بە بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی ڤۆڵتێر، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆرینەی خەڵك فەڕەنسی ناخوێنێتەوە، هەڵسان بە وەرگێڕانی ئەم کتێبانە بۆ زمانەکانی ئەرمەنی و تورکی و یۆنانی و جەختیان لەسەر لایەنە باشەکانی ڕژێمی کۆماری و پرەنسیپەکانی ئازادی دەکردەوەو کرێکرتەکانی خۆیان هەنارد بۆ ئەوەی شەیتان بجوڵێنن..."[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٤..

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

خالد ئەفەندی درێژەدەدات بە هێرشەکەی بۆ سەر فەڕەنسییەکان و چەمکی کۆماری، کە ڕوونترین بیروباوەڕەکان بوو لە هەڕەشەکردندا بۆ سەر ڕژێمی سەڵتەنەت. دەڵێت: "فەڕەنسییەکان بەهۆی ئەوەی پاشاکەیان نەماوە، بێ حکومەت ماونەتەوە، لەوەش زیاتر، بەهۆی نەمانی عەرش-وە زۆربەی پلەو پایەکان کەوتونەتە دەست خەڵکە پلە نزمەکان... کە لە کۆمەڵێك ئاژاوەگێڕ زیاتر هیچیتر نین یان بە تورکی ڕەوان: کۆمەڵێك سەگن. کارێکیشە نەکردەنی چاوەڕێی متمانە و دۆستایەتی لەم جۆرە خەڵکە بکەین"[1].

مێژوونوس عاسم ئەفەندی جەخت لەسەر هەمان ئەو مانایانە دەکاتەوەو سەبارەت بە چەمکی کۆماری دەڵێت: "کۆماری لە گەدەیەکی نەخۆش و ناتەندروست دەچێت کە دووچاری بەفیڕۆدان و قرمەقرم هاتووە، پرەنسیپەکانی لەسەر دەستهەڵگرتن لە ئایین و یەکسانکردنی هەژار بە دەوڵەمەند وەستاوە"[2].

ئاشکرایە چەمك و دروشم و بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەڕەنسی مەترسی هێزە کۆنەپارێزەکانی دەوروژاند و هانیدەدان لە دژی هەنگاوە چارەسەرسازیەکانی سەلیمی سێیەم کاربکەن. لە کۆتاییشدا ئەم هێزانە توانیان لەنێوی بدەن، بەڵام جەختکردنەوەیان لە ڕەخنەگرتن لە چەمکە نوێکان بەشێوەیەکی پراکتیکی گفتوگۆکانی سەبارەت بەم مەسەلە وروژاند، گفتوگۆیەك کە ژمارەی ئەوانەی بەشدارییان تیادا دەکرد هێدی هێدی بەرزدەبوونەوە.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

**دوو ئاقار**

ئەو ناكۆكیەی لە چەمكەكانی شۆڕشی فەرەنسی كەوتەوە، چ ئەوانەی لایەنگری بوون یان نەیار بەتەنها ناكۆكیەكی سیاسی سنووردار و بەرتەسك نەبوو، بەڵكو دەستپێكی جیاكردنەوەی دوو تێڕوانین بوو كە لەگەڵ سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەمدا بە خێرایی گەلاڵەدەبوو، هاوكات لەگەڵ خێرابوونی كردەی كاریگەرە فیكرییەكانی ئەوروپا، دروست لەو كاتەدا كە بانگێشەكارانی لاسایكردنەوە و لایەنگرانی كەلەپورو ئایین دۆستەكان خۆیان بەرامبەر تەوژمی كارتێكردنەكانی ڕۆژئاوا دەبینییەوە، كە بیرو ئاوەزی چینە گەنجەكە دەبڕێ وكار لە فۆرمەلەكردنی ئاقارەكان دەكات لای دەستەگەلێكی بەرفراوان لە توركەكان و موسڵمانەكانی ناوچەكانی تر.

لە واقیعدا سەرەتاكانی ئەم ناكۆكییە لە دەستپێكی سەدەی هەژدەهەم واتە دوای دەركەوتنی كاریگەرییە بەراییەكانی سەردەمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم دەركەوت، كاتێك فەرمانێكی سوڵتانی لە دژی هەندێ لە دوكتۆرە بێگانە و توركەكان دەرچوو ئەوانەی دەرمانی نامۆ تاقیدەكەنەوە و بەناوی پزیشكی نوێوە "داودەرمانی بێكەڵك" بەكاردەهێنن و پزیشكی كۆن پشتگوێ دەخەن[1]. كارەكە پەیوەندی بە تاقیكردنەوەی زانستێك و هەڵسەنگاندنی سوودەكەیەوە نەبوو، ئەوەندەی پەیوەندی بە دوو میتۆدی بیركردنەوەوە هەبوو. هەر بۆیە ئەو بەرەنگارییەی ڕۆژئاوا لەو كاتەدا پیشانیدا بە فەرمانێك لە دژی وەستانەوە، بۆ ئەوەی ڕێ لەو

---

[1] Adnan, A:La science chez les turcs.. P129

گۆڕانکارییە بگرن لەسەر شێوازی ژیان و میتۆدەکانی بیرکردنەوە بەجێیدەهێڵێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیەکان لە فرمانەکان بەهێزتربوون، ئەو سوڵتانەی کە فەرمانی دەرکردبوو بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی "پزیشکی نوێ"، خۆی یەکەمین "نوێگەرەکان" بوو، لە سەردەمی ئەویشدا ئەو ئاقارەی بانگهێشتی بۆ سوودوەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا دەکرد، گەڵاڵەبوو، ئیدی لەو کاتەوە ئەوەی دەکرێ ناوی لێبنەین ناکۆکی چەمکەکان، دەستپێکرد.

کاروانی سەدەی هەژدەهەم، کاروانێکی پاڵپشت و پشتگیربوو بۆ ئاقاری گەشەسەندوو بانگهێشتکار بۆ کرانەوە بەڕووی ئەورووپادا، ئەم کاروانە لەگەڵ دەرکەوتنی سەلیمی سێیەمدا گەیشتە ترۆپکی خۆی، کە دەیویست سیستمێکی نوێ لە شوێنی سیستمە کۆنەکە دابنێت، لە کەش و هەوایەکی هاندەردا بۆ گۆڕانکاریە گەورەکان، کە شۆڕشی فەرەنسی لەسەر ئاستی جیهان هێنابوویەکایەوە.

وێڕای ئەو پێشکەوتنانەی کە هێزە ڕۆشنگەراکان بەدەستیانهێنابو، بەڵام ئاقاری دژە گۆڕانیش لە هەمان کاتدا گەڵاڵەبووبوو. ئەگەر سوپای ئینکیشاری ئەو باڵە بوو کە دەبوونە بەربەست لە بەردەم هەوڵ و تەقەللاکانی ڕیفۆرم بۆ گەیشتن بەو سنوورانەی کە ئارەزووی بو پێیبگات، ئەوا دەزگای زانایانی ئایینی ئەو کانگا ئایدیۆلۆژییە بو، کە بەرپەرچی هەوڵەکانی ڕیفۆرمی دەدایەوە.

لەگەڵ سەلیمی سێیەمدا ئەوە تێبینی دەکەین کە هەندێ لە زانایان و پیاوانی ئایینی پشتگیری هەوڵە ڕیفۆرمکارییەکانی ئەویان کردووە، لەوانە تاتارجیق زادە کە ئەویش بیروڕای ڕیفۆرمکاری هەبوو. بەڵام تاتارچیق زادە لە نموونەی کەم بو، چونکە دەزگای

زانایان و پیاوانی ئایینی بەگشتی نەیاری کرانەوە بوون بەڕووی ئەوروپادا، کارە چارەسەرسازیەکانی سەلیمی سێیەمیشیان وەك جۆرێك لە بیدعەو کوفر دەبینی. ڕەفتاری پیاوانی ئایینی ئەوانەیان کە پشتگیری ئاقارە نوێگەراییەکەی سەلیمی سێیەم-یان دەکرد، گوزارشتی لە ئاقاری تەواوی دەزگای ئایینی نەدەکرد. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەو شۆڕشەی لە ساڵی (١٨٠٧ن)دا سەلیمی سێیەمی لەسەر تەخت لادا و ڕیفۆرمەکانی بەزەبری چەك وەستاند، پاڵپشتکردنی شەیخولئیسلام موحەممەد مونیب و قازی ئەستەمبوڵ موراد زادە و زاناکانی تر بوون لە سوپای ئینکیشاری. ئەوانە "حجة شرعية"یەکیان مۆرکردو تیایدا ڕیفۆرم و نیزامی نوێیان تاوانبارکرد، گوایە بیدعەکاری و شوێنکەوتن و لاسایکردنەوەی کافرانە[1].

دژایەتیکردنی زانایان و پیاوانی ئایینی یەکلایکەرەوە بوو لە کۆتایهێنان بە ئەزموونەکەی سەلیمی سێیەم، بەڵام ئەم دژایەتیکردنە بەتەنها مەسەلە سیاسی و فیکرییەکانی نەدەگرتەوە، بەڵکو تێکڕای ئەو شتانەی دەگرتەوە کە پەیوەندیان هەبوو بەکرانەوەوە بەڕووی ئەوروپاو دەستهەڵگرتن لە نەریتە ڕەگداکوتاوو دێرینەکان. هەر بۆیە پیاوانی ئایینی ڕووبەڕووی لەگەڵ هەر ڕەفتارێکدا ڕووبەڕوەبوونەوە کە بۆنی شوێن کەوتن و لاسایکردنەوەی ئەوروپای لێدەهات، وەك ئەو تابلۆیەی "Portrait" کە بۆ خودی سەلیمی سێیەم کێشرابوو، یان گۆڕینی جل و بەرگ ئەوەی کە دواتر مەحمودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩ن) سەپاندی. نەیارانی کرانەوەو ڕیفۆرم کاریان بەم وتە باوە دەکرد "ئەوەی لاسایی قەومێکی تر

[1] Heyd, U: The Ottoman Ulema and Westernization in the time of selim III and Mahmoud II. Scripta Hierosolymitana IX (1961) P:69.

بکاتــەوە، وەك ئــەوانی لێــدێت" واتــە ئــەوەی شــوێن کــردەوەی ئەوروپیـەکان بکـەوێت، وەکو ئەوانی لێهاتووە، کافر بووە و ڕەوایـە لابدرێت و تاوانباربکرێت.

زانایــان و پیــاوانی ئــایینی هێــزو توانــای خۆیــان هــەبوو، سوڵتانیش بۆ خۆی دەسەلاتێکی ڕەهـای نـەبوو ئەگەرچی بەشێوە وادیــاربو، هــەر بۆیــە هێــزی دژو نــەیار بــە ڕیفۆرمــەکان هەمیشــە ئامادەبوون. "غۆفێیە"ی باڵوێزی فەڕەنسا لـە ئەستەمبوڵ لـە ساڵی (١٧٨٦ز)دا ئەمـەی تێبینیکـردووە لـە یـەکێك لـە نامەکانیـدا دەڵێـت: "لێرە (مەبەستی لـە ئەستـەمبوڵە) مەسـەلەکە وەك فەڕەنسا نیـە کـە پاشا خۆی دەسەلاتداری ڕەهایە. پێویستە زانایان و پیاوانی یاساو وەزیرەکــان ئەوانــەی لــە دەســەلاتدان و ئەوانــەی لــە دەســەلات دورخراونەتەوە ڕەچاو بکرێن.."[1]

ئاقاری ئایینی لەسەر ئاستی دەسەلات قورسایی خۆیان هەبوو، بگــرە لــەوەش زیــاتر زانایــان و لایــەنگرانیان لــە ژیــانی ڕۆژانــەدا ئاقـارێکی ئـەکتیڤیان پێکـدەهێنا کـە "قوتابخانـە" سـەنتەر و چـەقی چالاکیەکانی بوو، بەردی بناغەی دام ودەزگای ئایینی قوتابخانە، کە بوو بوو بە بازنەیـەك بۆ هێزە موحافزکارو و نـەیارەکانی ڕیفۆرم: " یەکێك لە گروپە سەرەکیەکان ئەوانەی دژایـەتی ڕیفۆرم و حکومـەتی عوسمــانی و ئــەو خەڵکــەی دوای ســتایل و شــێوازی ئــەوروپی دەکەوتن، گروپی قوتابیەکان بوون لە قوتابخانە ئاینیـەکان، ئەوانـەی بە ناوی"صوفتاس" ناسرابوون و ژمارەیان یەکجار زۆر بوو[2].

---

[1] Pingaud , L:Choiseul- gouffier..P..82

[2] Heyd, U: The Ottoman Ulema..P. 71

لێرەوە سولّتان سەلیمی سێیەم کاری دەکرد بۆ دامەزراندنی خوێندنگەی نوێ، لە دەرەوەی دەسەلآت و کاریگەری "قوتابخانە-مەدرەسە"ی سونەتی، لە بوارەکانی ئەندازیاری و بیرکاری و بوارەکانی تر. بۆ سەرخستنی بەرنامەکەی شارێکی نوێی لە Scutari بوونیادنا تا دوور لە گوشاری هێزە سونەتیەکان ببێتە سەنتەری پەیمانگاو چاپخانەو هێزە نوێیەکەی. لێرەوە دوو ئاقاری جیاواز سەریانهەلّدا: ئاقارێکی سونەتی کە زانایان نوێنەرایەتییان دەکردو دەوری قوتابخانە ئایینیەکانیان دابوو، ئاقارێکی نوێی تازە گەشەسەندوو کە دەوری خوێندنگە و پەیمانگا نوێکانیان دابوو. وێرای ئەو پەرەسەندنە خێرایە کە پەیمانگا نائایینییەکان بەخۆیانەوە دیتیان، بەلآم لە ژیانی عوسمانیدا قوتابخانە بە چوست و چالاك مایەوە: "نە قوتابخانەو نە قوتابخانە فێرکارییەکان کە لە بازنەی هەژموونی دەسەلآتی ئایینیدا کاریان دەکرد، هەلّنەوەشانەوە. ئەم دوو ئاراستەیە لە بواری فێرکردندا بۆ ماوەیەکی درێژ فۆرم دەبەخشنە پەرەسەندنی بیروباوەڕەکان.. و دەبنە خەسلّەتی سەرەکیی بۆ قۆناغی گواستنەوە"[1].

شایەنی ئاماژەپێدانە ئەو خوێندکارانەی لە پەیمانگا نوێکان دەیانخوێندو بەزانیاری ومەعاریفی نوێ گۆشدەکران، هەر یەکەیان ناوی "هونەرمەند"ی لێدەنرا، "زانا"ش وەك ناو و نازناوی هەر تەلەبەیەك کە لە قوتابخانە ئایینییەکاندا دەیخوێند، مایەوە[2]. ئەم جیاوازییە گوزارشت لە بواری جیاوازی هەر گروپێك لەو خوێندکارانەی دەکات. بوونی دوو ئاقاری ئاشکرادەکەن، کە خێرا ناکۆکی لە نێوانیاندا گەردگیردەبێت لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا.

---

[1] Dino, G: La genese du Roman Turc au XIX0. Siecle. P.21

[2] ADNAN, A: La science chez les turcs…PP.160-161

"شتێکی سروشتیش بوو کە هاتنی بیروباوەڕی نوێ بێ بەرهەڵستی یـان خۆگونجانـدن لەگـەڵ واقیعـدا نـەدەبوو، کۆنـەپارێزەکان لای خۆیانـەوە هـاتنی هـەر شـتێکیان لـە ڕۆژئـاواوە وەك زەنـدیق و پڕوپوچی فەرەنسایی دەبینی.." [1].

لەگەڵ ئاڵۆزبوونی ناکۆکییەکاندا لە نێوان چەمك و ئاقارەکانـدا، تەڵەزگەیەك سەریهەڵدا، کە بۆ ماوەیەکی درێژ دەوڵـەتی عوسمـانی و تورکیای سەرقاڵکرد، دەتوانین دەرکەوتەکانی ئەم تەڵەزگە لـە ژیـانی کۆمەڵایەتیدا تێبینی بکەین، بۆ وێنە لەنێوان جل و بـەرگ و سـتایلی ڕۆژئـاوایی و ڕۆژهەڵاتیـدا، لـە نێـوان شـەرعی ئیسـلامی و یاسـای فەرەنسـیدا، هـەروەها لـە ژیـانی ڕۆشنبیرییشـدا نـاکۆکی لـە نێـوان ئاقـاری سـونەتی و کەلـەپوری ئیسـلامی و لـە نێـوان مەعریفـەی ئەوروپایدا هاتەکایەوە.

### ئاسۆکانی ئەزمونەکەی سەلیمی سێیەم

ئەزموونە ڕیفۆرمکاریەکەی سەلیمی سێیەم کۆمـەڵێك بـەرەنجامی جـێگیری هـەبو، بەدیوێکـدا ئـەوەی دوپـاتکردەوە کـە ئـەو هـەوڵ و تەقەللانەی لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمەوە بە چەند قۆناغێکی جیـاواز دراون، ئاڕاسـتەیەك بـوو لـە میـانی نوێکردنـەوەی دام و دەزگاکـانی عوسمانییـەوە پێش هـەمان سـەدە پتـەو جێگیربوبـوون، بـەدیوێکی تـردا سـەردەمی سـەلیمی سـێیەم ئـەوەی سـەلماند لەگـەڵ هەڵکشانی هێزی ئەوروپاو بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسـی بەتـەواوی دونیـادا کرانـەوە بـەڕووی ئـەوروپاو ڕۆشنبیرییەکەیدا کارێك بو هەڵاتنی بۆ نەبو.

---

[1] Bombaci, A: Historye De la Litterature torque..P351

له واقیعدا ناکۆکیەك، کە بەرەنجامەکانی لە بەرژەوەندی سوڵتان و یاریدەدەرەکانیدا نەبو ڕوویدا، دوای ئەوەی "یاماق Yamak" لەبەرکردنی جل و بەرگی سوپایی ڕەتکردەوە، لە ١٥ی ئایاری (١٨٠٧ن)دا ڕاپەڕینێك لە دژی سەلیم بەرپابوو، لە ماوەی دوو هەفتەی دواتریشدا لە ئەستەمبوڵ دا پڕوپاگەندە لە دژی ڕیفۆرمەکانی زیادیکرد. سەرانی ڕاپەڕین لیستێکیان بۆ ناوی لایەنگرەکانی سوڵتان و کەسە دڵگەرمەکان بۆ ڕیفۆرم و کرانەوە بەڕوی ئەوروپادا ئامادەکردو فەرمانی مردنیان لە دژیان جێبەجێکرد. لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان هیواخوازبوو لەسەر تەخت بمێنێتەوە، ئەوەبوو "خەت شەریف"ی ڕاگەیاندو "نیزامی نوێ"ی هەڵوەشاندەوە، بەڵام چارەنوسی سوڵتان پێشتر دەستنیشانکرابوو، ئەوەبوو لەسەر تەخت هێنرایەخوارو عەبدولحەمیدی مامیان، بە ناوی موستەفای چوارەمەوە لە جێگەکەی دانا.

بەڵام کۆتایی سەلیمی سێیەم نزیکەی پاش ساڵێك لە هێنانەخوارەوەی لەسەر تەخت ڕوویدا، ئەوکاتەی موستەفای بەیرەقدارو سوپاکەی لەگەڵ سوپای چەلەبی موستەفا پاشای وەزیردا هەوڵەکانیان خستەگەڕ بۆ گێڕانەوەی کارکردن بە تەنزیمات و گێڕانەوەی سەلیمی سێیەم بۆ سەر تەخت. ئەوەبوو موستەفای چوارەم فەرمانی کوشتنی سەلیم و مەحمودی برای دەرکرد، پێش ئەوەی سوپاکەی بەیرەقدار بگاتە سەرای فەرمانی کوشتنی سەلیم بەشێوەیەکی نامرۆڤانە جێبەجێکرا، بەڵام مەحمود توانی خۆی ڕزگاربکات و لە دواییشدا ببێت بە سوڵتانی نوێ.

لەم کودەتاوە کە ئاکامەکەی بە کوشتنی سەلیمی سێیەم و چونە سەر تەختی مەحمودی دووەم لە ساڵی (١٨٠٨ن) کۆتایهات، تا کودەتای دەستوری لە ساڵی (١٩٠٨ن)دا، سەد ساڵی تەواوە، لەو

ماوەدا کاریگەری فیکری ئەورووپی بە جۆرێکی جێگیرو پتەو خۆی دەسەلماند، سولْتان مەحمودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩ز) هەمان رێبازی سەلیمی سێیەمی گرتەبەر، چەندین نێردراوی رەوانەی ئەورووپا کرد، خوێندنگەی نوێی بوونیادناو راگەیاندراوێکی هاوشێوەی مافەکانی مرۆڤی دەرکرد، تیایدا یەکسانی لە نێوان سەرجەم هاولآتیانیدا لە سەرجەم ئاینەکان راگەیاند: "نیازەکانی ئێمە ئەوەیە موسلْمانەکان تەنها لە مزگەوتەکانیاندا موسلْمان بن. لە سۆنگەی هەمان بۆچوونیشەوە، مەسیحیەکانیش تەنها لە کلێسکانیاندا مەسیحی بن... دەمەوێ لە دەرەوەی ئەم شوێنانە رێز لە هەموو بیروباوباوەڕەکان بگیرێت، هەموانیش هەمان مافی سیاسی و چاودێری باوکانەی منیان بەرکەوێت"[1].

بێگومان گرنگترین ئەو کارانەی سولْتان مەحمودی توانی جێبەجێیانبکات، بنەبڕکردن و لە ناوبردنی سوپای ئینکیشاری بوو لە سالْی (١٨٢٦ز)دا، ئەوە کارێك بوو لە ماوەی دوو سەد سالْی پێشووترداو لە سەردەمی عوسمانی دووەمەوە چەندین جار تاقیکرابووەوە، بەلآم بێ ئاکام بوون، ئەو ریفۆرمە گرنگانەی کە جێبەجێیکردن و لە مەودایەکی دوردا کاریگەرییان وەدەرکەوت، ئەوانەبوون کە لە بوارەکانی فێرکردندا ئەنجامدران، ئەم ریفۆرمانە لە ماوەی چەند نەوەیەکی جیاوازدا چەندین دەستەی رۆشنگەری لێکەوتەوە کە ژمارەیان هەمیشە زیادی دەکرد.

---

[1] KARAL, E. Z: La transformation du la turquie P.433

ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم نەهاتبوو، ڕۆژنامەگەرییەکی دیسپلین و ڕیکخراو کە پڕوپاگەندەیان بۆ شۆرشی فەڕەنسی دەکرد، بەدیارکەوت، بەلاّم قەڵەمبازی ڕۆژنامەگەریی لە ساڵی(١٨٦٠ن)دا ڕوویدا، ئەو کاتەی ڕۆژنامەی "ترجمان ئەحوال" دەرچوو. دوو ساڵ پاش ئەوەش ئیبراهیم شناسی (١٨٢٦-١٨٧١ن) گۆڤاری "تصویری ئەفکار"ی دەرکرد. هەروەها ڕۆژنامەی تر بە زمانەکانی فەڕەنسی و یۆنانی و ئەرمەنی لە ئەستەمووڵدا دەرچوون. جێی ئاماژەپێدانێکی تایبەتە لەم ڕووەوە شناسی ڕۆڵێکی پێشەنگانەی هەبو، پاش تەواوکردنی پێنج ساڵی خوێندن لە پاریس، مەسەلەی بلاّوکردنەوەو ناساندنی ئەدەبیاتی فەڕەنسی لە ئەستۆگرت، ئەوەبوو لە گۆڤارەکەیدا دەستی دایە وەرگێڕانی شیعرەکانی "لافونتین"و "ڕاسین"و "لامارتین". لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمیشدا لەگەڵ شەمسەددین شانی (١٨٥٠-١٩٠٤)دا، پەرەسەندنێکی گرنگ ڕوویدا، کاتێك ئەو بو بە یەکەم کەس، کە بە تورکی چیرۆك بنوسێت، لە بەرهەمەکانیشی "تعشقات طلعت و فتنت" بوو[1].

بەلاّم ئەو کەسەی کاریگەریەکی مەزنی هەبوو، نامیق کەمال (١٨٤٠-١٨٨٨ن)ی شاعیر و نووسەر بوو، کە لە سەرەتادا لەگەڵ "شناسی" دا کاری دەکرد، خۆی بە تەنیا گۆڤاری (تصویری ئەفکاری) دەردەکرد. ناوبراو چەندین جار دورخراوەتەوەو بەندکراوە، دواتریش بە هاوکاری لەگەڵ کەسانی تردا لە ساڵی (١٨٦٢)دا ڕۆژنامەی "حریت"ی دەرکردووە، و بیروباوەڕەکانی ئازادی و نیشتمانی بلاّوکردووەتەوە کە لە ڕۆژگاری ئەودا وەرگێڕدران بۆ دروشمگەلی سیاسیی ئەکتیڤ و چالاك: " بە هۆی نامیق پاشا شیعرو پەخشانە ڕەوان و کاریگەرەکانیەوە

[1] بۆ زیاتر بڕوانە: لێکۆڵینەوەکانی Dino و Bombaci کە لە سەرەوە ئاماژەیان بۆکراوە.

بیروباوەرەکـانی ئـازادی و نیشـتمان، کـە ڕای گشـتی سیاسـیان دەبزواند، بڵاوبوونەوە"[١].

بەڵام شیعری نوێ لەگەڵ عەبدولحەق حەمید (١٨٥١٠-١٩٣٧)دا، کە قوتابی نامیق بو، دەرکەوت، حەمید توانی لە بواری شیعردا، کە تـا ئـەو ڕۆژگـارە بەتـەواوی لـە فۆرمـە کۆنـەکانی ڕزگـاری نـەبوبوو، شـۆڕش بـەرپابکات: "ئـەم شـاعیرە پـڕ بەرهەمـە تـوانی جۆرەکـانی شـیعری گـۆرانی و درامـاتیکی بێنێتـە نێـو زمـانی تورکیـەوە، لـەم ڕووەوە نووسینەکانی هـەر یـەك لـە "دانتـێ"و "ڕاسین"و "کـۆڕنێ"و "شکسپیر" نموونەیان پێ بەخشیوە.."[٢].

لەگـەڵ ئـەم پێشـەنگانەدا دەرگاکـانی کاریگـەری ئـەورووپی بەشێوەیەکی پان و بەرین کرانەوە، لەگەڵ ئەماندا شێوازە نوێیەکانی نووسین لـە ڕۆمـان و شـانۆو شـیعر هاتنـە نێـو زمـانی تورکییەوە، لە واقعیشـدا پەرەسـەندنی شـێوازەکانی دەربڕینـی ئـەدەبی هـەم کاریگـەری و هـەمیش هاوسـەنگییان لەگـەڵ شـێوازەکانی دەربڕینـی سیاسـی و ئـەو وەرچـەرخانانەی کـە دەوڵـەتی عوسمـانی بەدرێـژایی سەدەی نۆززدەهەم بەخۆوەبینی، دروستکرد[٣].

وەك چـۆن فەیلەسـوفە ڕۆشـنگەراکانی سـەدەی هەژدەهـەم زەمینەیان بۆ شۆڕشی گەورەی فەڕەنسی ساڵی (١٧٨٩ز) خۆشکرد، بەهـەمان شـێوە ڕۆشـنگەراکانی عوسمـانیش، ئەوانـەی وەك نموونەیەکی باڵا تەماشای شۆڕشی فەڕەنسییان دەکرد، زەمینـەیان بـۆ شۆڕشـی دەسـتوری سـاڵی (١٩٠٨ز) خۆشـکرد، کـە لای

---

[1] Tansel, F. A: art Kemal.Ei2 , Vol 4.PP 908-912

[2] Dino :La Genese du Roman …P.35

[٣] بۆ زانینی پەرەسەندنی فیکرو بیرو باوەڕەکان لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا بڕوانە Berkes، ی سەرچاوەی پێشووتر ئاماەپێکراو، هەروەها بڕوانە:

press 1962. Mardins S:The genesis of young ototoman Thought. Prenciton University

هاوڕۆژگارەکـانی مەزنـە کۆدەتایەکـە سـیمای دەوڵـەتی عوسمـانی دەگۆڕێ و لە دۆخی داتەپین دەریدەهێنی و بەرزیدەکاتەوە بۆ ئاستی وڵاتـە ئەوروپیـەکان.[1] لەواقعیشـدا شۆڕشـی دەسـتوری سـاڵی (١٩٠٨)ن لەسـەر ئاسـتی دەسـەڵاتی سیاسـی لەئەسـتەمبوڵ دا زۆر شـتی گـۆڕی، ئـەم گۆڕانـەش شـوێنەواری خـۆی لەسـەر تێکـڕای هەرێمـەکانی ئـەو ڕۆژگـارەی دەوڵـەتی عوسمـانی بەجێهێشـت، بەتایبـەت لـە ڕووی دزەکردنـی بیروباوەڕە ئازادیخوازەکانـەوە، کـە سـەرانی ڕژێمـی نـوێ بانگەشـەیان بـۆ دەکـرد، لەوانـە بـەکارهێنانی دروشمـەکانی شۆڕشی فەڕەنسی[2] و لێدانی پـارەی نـوێ، کـە ئـەم دروشمانەی لەسەر نوسرابوو: ئازادی، یەکسانی، بەو پێیەی ئیسلام ئایینی دادپەروەرییە وشەی دادپەروەریشیان خستبووە جێی وشەی برایەتییـەوە، بـەڵام گونجانـدنی ئیسـلام لەگـەڵ فیکـری ئەوروپیـدا کارێکی ئاسان نەبوو. هەروەها گێڕانەوەی شکۆی سەربازیی دێرینی عوسمـانی کارێکی مـەحاڵ بـوو، بۆیـە ئـەو پەرەسـەندنانەی دەوڵـەتی عوسمانی لە سـەرەتاکانی سـەدەی بیستەمەوە بەخۆیەوەبینی، لەوە زیاتر کە کۆتایی ئەم دەوڵەتەی خێراترکرد، سوودێکی تریان نەبوو.

---

[1] سولەیمان بوستانی بڕوای وابوو ماوەی (٢٥) ساڵ بەسە، بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە کێشەکانی دەربازبێت و هێزی خۆی وەدەستبێنێتەوە.. بڕوانە : سليمان البستاني: عبرة و ذكرى أو الدولة العثمانية قبل الدستور و بعده- تحقيق خالد زيادة.دار الطليعة بيروت ١٩٧٨ن ص ص ٢٣٧-٢٥٠.

[2] عبدالمسيح الأنطاكي بە ناونیشانی (نيل الاماني في الدستور العثماني عام ١٩٠٨، - مطبعة العرب في مصر ١٩٠٩ ) کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە، "سەرجەمی ئەو شتانەی تێدایە کە پەیوەندیان بەو دەستورەوە هەیە کە لە ٢٤ی تەمووز/یولیوی ١٩٠٨ دا ڕاگەیەندراوە، بە گوتەزاکانی ڕۆژنامە عەرەبی و تورکی و ئەوروپیەکانیشەوە لەگەڵ گوتاری مامۆستایانی مزگەوت....هتد"، خوێندنەوەی ئەم کتێبەو باسە جۆراوجۆرەکانی کاریگەری کودەتاکە لەسەر بەرینکردنی بازنەی گفتوگۆکان سەبارەت بە چەمکەکانی وەك ئازادی و دیموکراسی و دەستور و هیتر، بۆ ئاشکرادەکەن.

# ئه نجام

سەدەی هەژدەهەم سەدەی گۆڕان و وەرچەرخانەکان بوو، نەك تەنها لەسەر ئاستی ئەورووپا، بەڵکو مەسەلەکە گشتگیربوو لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی، وڵاتە ئەورووپیەکان بەهۆی بڵاوبوونەوەیان لە دەرەوەی سنوورەکانی خۆیان و سەلماندنیان بۆ هێز و پێشکەوتنەکانیان لای ئەو گەلانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ دەگرتن، لە خێراترکردنی ئەو گۆڕانکاریانەدا لای ئەو گەلانە کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەیان هەبوو. دەوڵەتی عوسمانی بە تێکڕای ویلایەتەکانیەوە لە ئەورووپاو ئاسیا زۆرترین کاریگەرییەکانی ڕێنیسانس و ڕابوونی ئەورووپییان لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا بەرکەوت، هۆکاری ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە جوگرافیای دەوڵەتی عوسمانییەوە هەبوو، کە لەگەڵ ئەورووپا هاوسنوربوو و ئامادەیی تیانەبوو دان بە سنوورێکدا بنێت مێژووی دێرین بەخشیبێتی، خودی هۆکاریی مێژوویش لەم مەسەلەدا ڕۆڵی کارای خۆی گێڕابوو، چونکە ناکۆکی عوسمانی-ئەورووپی یان مەسیحی- ئیسلامی، کە دەگەڕایەوە بۆ چەندین نەوەی پێشوتر، وێڕای ئاڵوگۆڕی پێدراوەکان و گۆڕانی هاوسەنگیەکانی هێز کەچی بەردەوامبوو، ناکۆکی لەسەر هەرێمەکانی ئەورووپای ناوەندو ڕۆژهەڵات هێشتا بەردەوام بوو. لەگەڵ کرانەوەی دەرفەتدا بۆ دەریاوانی ئەورووپی بۆ سەلماندنی هەژموون و باڵادەستی نوێی خۆیان بەسەر هێزی دەریاوانی پێشوتری عوسمانیدا، بەرەنگاربوونەوە لە چوارچێوەی دەریای ناوەڕاستدا درێژەی هەبوو.

لەواقیعـدا گـۆڕان و وەرچـەرخانەکان لەسـەر ئاسـتی عوسمـانی لەگـەڵ دەسـتپێکی سـەدەی هەژدەهەمـدا دەرکـەوتن و ئاشـکرابوون، شکستەکەی ساڵی (١٦٩٩ز) یەکێك لە هێما هـەرە ئاشکراکانی بـوو، لەو کاتـە بەدواوە عوسمانییـەکان هەندێ نیمچە سەرکەوتن نـەبێت، بەشیان هەمیشە بـەزینی گـەورەی سـەربازی بوو. ئەم لاوازییـە کـە سـوڵتانەکان و وەزیرەکـانی و داروودەسـتەکەی هەسـتیانپێکردبوو، شوێنەوارەکانی لە ناوخۆدا دەرکەوتبوون، لاوازی سەربازی بـە تـەنها لاوازبوونێك نەبوو لە ئاست ئەوروپا، بەڵکو لاوازبوون بـوو لـە ئاست هەر هێزێکی تردا.

لـــە ســـەردەمی ئەحمـــەدی ســـێیەم (١٧٠٣-١٧٣٠ز)دا، عوسمانییـەکان ڕووبـەڕووی دوژمنێـك بوونـەوە کـە ئاسـان نـەبوو، ئەوانیش ئێرانیەکان بوون. لە سەردەمی مەحمودی یەکـەم (١٧٣٠-١٧٥٤ز)دا، نادر شا توانی لە ساڵی (١٧٣٣ز)دا عێراق داگیربکات، تا کۆتایی ساڵی (١٧٤٧ز) ویلایەتی بەغداد لەژێر دەسەڵاتی نادر شادا مایەوە[1].

لە بازنەی عەرەبیدا، دەوڵەتی عوسمانی لـە ئەستەمبوڵ دووربوو لەوەی بتوانێ کار لەو ڕووداوانە بکات، کە ویلایەتـە عەرەبیـەکانی لـە ئاسـیاو ئـەفریقیا دەیـانبینی بەخۆیانـەوە، بـۆ وێنـە سـەرکردە لۆکاڵیەکان لە تونس و جەزائیردا وێڕای هێشتنەوەی پەیوەندیـەکی شکڵی لەگەڵ بابیعالیدا دەسەڵاتی خۆیـان سەلماندبوو. لە ویلایـەتی تەرابولسـی ڕۆژئاواشـدا، بنەماڵـەی قـەرەمانلی توانییـان لـە سـاڵی (١٧١٣ز)وە سـەربەخۆیانە حـوکمڕانی بکـەن، ئەحمـەد قـەرەمانلی توانی وەك پاشای تەرابلوس دانپیانانی سوڵتان دەستەبەربکات. بەم

---

[1] لونکریك. س.ه: اربعة قرون من تاريخ العراق. بغداد. الطبعة الخامسة بدون تاريخ، ص ص١٥٤-١٧٣.

جـــۆره قەرەمانلیـــەکان توانییـــان لـــەم ویلایەتـــەدا، کـــارگێڕی ســـەربەخۆیانەی خۆیـــان بپـــارێزن و لەگـــەڵ وڵاتـــە جیاوازەکـــانی ئەوروپادا پەیوەندی دیپلۆماتی ببەستن و لەسەر خەرجی تایبەتی خۆیشـــیان تـــا ســـاڵی (١٨٣٥ز) جەنگـــە ناوخۆییـــەکانیان درێژەپێبدەن[١].

لـــە میسریشـــدا مەمالیکـــەکان توانیـــان لـــە ســـاڵی( ١٧٥٧ز) دا بەڕێبەرایـــەتی عـــەلی بـــەگی گـــەورە هـــەژموون و دەســـەڵاتی خۆیـــان وەدەستبێننەوەو دوای ١٠ ساڵ لە حوکمڕانییکردنی فەرمانی لێدانی پـــارەی دەرکـــردو بـــەئامارژەو نیشـــانەکانی خـــۆی دیـــاریکرد، ئـــەم هـــەنگاوەش هێمـــای ســـەروەری بـــوو[٢]. بـــە مردنیشـــی لـــە ســـاڵی (١٧٧٣ز)دا، لە میسردا دۆخەکە نەگۆڕا، چونکە جێنشینەکانی[٣] تا هێرشەکەی ناپلیۆن لە ساڵی (١٧٩٨ز)دا، درێژەیان بە کارەکانیدا.

دۆخی فەلەستین هاوشێوەی دۆخی میسر بوو، زاهیر ئەلعومەری لە ساڵی (١٧٥٠ز)دا، توانی بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك خۆی بکاتە دەســـەڵاتدارو گـــەورەی عـــەکا و ناوچـــەکە، جێنشینەکەشـــی، کـــە عوسمانییەکان لە ساڵی (١٧٧٥ز)دا خستیانە شوێنەکەی، توانی بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەکی تر، تا مردنی لە ساڵی (١٨٠٤ز)دا، ببێتـە دەسەڵاتداری ڕەهای فەلەستین و شام[٤].

---

[١] VADALA, R:Essais sur L'histoire de karamanlis pacha de la trepolitaine de 1711 - 1835. Larevue De L'histoire des colonies francaises, VII\2 (1919) PP.117-288.

[٢] قولني، ثلاثة اعوام في مصر و بر الشام. دار المكشوف بيروت ١٩٤٩ الجزء الاول ص ص٨٠-٨٩.

[٣] هەمان سەرچاوە، ل٩٧ و دواتر.

[٤] لەم ڕووەوە بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوە گرنگە:

- Hourani, A:The changing face of fertile c recent in the XVIII0 Century. Studia Islamiqa N08 (1957) PP.89-122.

بێجگە لەم هەولآنە، کە خۆی لە دامەزراندنی چەند میرایەتیەکی لۆکاڵی سەربەخۆدا دەبینیەوە، دەوڵەتی عوسمانی بە بەرپابوونی بزاڤێکی ئاینی لە ساڵی (١٧٤٥ن)دا لە دورگەی عەرەبی، ڕووبەڕووی هەڕەشەیەکی مەترسیدار بووەوە، دەوڵەتیش لە هەڵکشان و گەورەبوونی وەهابیەکان بەئاگانەهاتەوە، تادوای هەڕەشەکردنیان لە هەردوو ویلایەتی دیمەشق و بەغداد. بەوجۆرە تا دەرکەوتنی هێزێکی نوێ لە بازنەی عەرەبیدا، وەهابیەکان بەسەر دورگەی عەرەبدا زاڵ و بالآدەستبوون. تا ئەو کاتەی موحەممەد عەلی پاشای میسر بۆ بەرژەوەندی سوڵتان مەحمودی دووەمی عوسمانی[١] توانی لە ساڵی (١٨١٨ن) دەوڵەتەکەیان لەنێوبدات، بەڵام پاشای میسر لە کۆتایدا بوو بەخاوەن ئەو ئامرازو کەرەستانەی کە یارمەتیدا هەڕەشە لە خودی سوڵتان بکات.

ئەگەر ئەمە دۆخی ویلایەتە عەرەبیەکانی عوسمانی بێت لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا، ئەو دۆخەی ئاسانکاری بۆ دزەکردنی بەرژەوەندی و کاریگەریە ئەوروپیەکان کرد، ئەوا هەل و مەرجەکان لە ناوخۆی عوسمانیدا جیاوازیەکی لەگەڵ ناوچەکانی تردا نەبوو، خەونی میرە خۆماڵیەکان بۆ دامەزراندنی قەوارەو دەسەڵاتی سەربەخۆ لە ئەنادۆڵ و لە بەلقانیشدا دەرکەوتن. عەلی پاشای یانینا Janina نموونەیەکی دیارە کە توانی لە ساڵی (١٧٨٨)وە چەند بەشێك لە ئەلبانیا (و باکوری یۆنان.و.) دابڕێت[٢].

---

[1] زانیاری جۆراوجۆر سەبارەت بە محەممەد پاشا لەم سەرچاوەدا دەبینیتەوە: حجار، جوزیف: اوربا ومصير الشرق العربي، المؤسسة العربية بيروت ١٩٧٦.

[2] SHAW. S. J:Between old and new…PP228230

ئەم گۆڕانکارییانە سوڵتانەکانی دنەدا، تا داخوازییان لەسەر ئەو هۆکارو ئامرازانەی هێز دوپاتبکەنەوە کە دەسەلأتیان بۆ ویلایەتە جوداخوازەکان دەگێڕێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هێزو توانای خودی سوڵتانو دەسەلأتەکەی ڕوو لەدابەزین بوو، هەر لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمەوە وێنەی ئەو سوڵتانەی خاوەن هەڵس و کەوتێکی ڕەهایە، نەمابو. لە دەستپێکی سەدەی حەڤدەهەمدا ئەوە دەرکەوت کە ڕەنگە سوڵتان لە لایەن دەستەگەلێکەوە ڕووبەڕووی پلانێکی ئاشکرا بێتەوە، کە بۆ دەسەلأت ناکۆکی لەگەڵ دەکەن. کوشتنی عوسمانی دووەم لە ساڵی ١٦٢٢ز[1] ئەم مەسەلەی بە تەواوی سەلماند. لەو کاتەوە ئیدی بەڕوونی ئەوە دەرکەوت سێ لایەن دەسەلأتی عوسمانی دەجوڵێنن، ئەوانیش پێکهاتوون لە: سوڵتان، سوپای ئینکیشاری و پیاوانی ئایینی.

ئەم دۆخە ئەوەمان بۆ ڕاڤەدەکات کە چۆن سوڵتانە یەك لە دوای یەکەکان دوای کوشتنی عوسمان هەوڵ و کۆششیان دەکرد کاری ڕیفۆرمخوازی بکەن، یاریدەدەرە ڕاستەوخۆکانی سوڵتانەکان بینییان چۆن لە کاتی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی هۆکارەکانی کەنەفتی و لاوازی دەوڵەتدا دەستی تاوانیان بۆ ئینکیشاریەکان و پیاوانی ئایینی وەك یەك ڕادەکێشا، لە هەوڵەکانی هەر یەك لە قوچی بەگ و حاجی خەلیفەو حسێن هەزار فەن دا ئەمەمان تێبینیکرد. لە واقعیشدا وێنەی ناکۆکی و ڕکابەری لەسەر دەسەلأت سوڵتانەکانی والێکرد لە شێوەی ڕیفۆرمخوازێکدا دەرکەون. لە کاتێکدا سوپای ئینکیشاری و گروپی پیاوانی ئایینی لە پێگەی هێزێکی نەیاردابوون دژ بە هەر هەنگاوێکی ڕیفۆرمخوازی. ئەم ناکۆکیە لە

[1] بڕوانە بەشی دووی ئەم کتێبە.

ماوەی دوو سەد ساڵدا[1] دۆخی سیاسی ناوەکی دەوڵەتی عوسمانییان ڕەنگڕێژکردبوو، کە لە میانەیەوە ئاقاری جیاوازو ناکۆکیان لەگەڵ یەك جێگیرکردبوو، بەم جۆرە کاریگەرییەکانی ئەوروپا دەیانتوانی بە ئاسانی بپەڕنەوە بۆ نێو هەناوی عوسمانی.

ئارەزووی سوڵتانەکان بۆ کرانەوە بەسەر ئەوروپادا هەمیشە لاوازو بێبنەما نەبوو. چونکە ویستی چنگ گیرکردن لە دەسەڵات پاڵی پێوەدەنان بە دوای ئەو ئامرازو کەرەستە ئەکتیڤانەدا بگەڕێن کە سنوور بۆ ئاغا ئینکیشارییەکان و پێڕاکێشانی پیاوە ئایینەکان دادەنێت. سوڵتان ئەحمەدی سێیەم یەکەم کەس بوو هەوڵ و تەقەللای دا لەدەرەوەی بازنەی سوپای ئینکیشاری ڕیفۆرم و چاکسازی ئەنجامبدات. هەڵبەتە بەسوودوەرگرتن لە دۆخی شکست و دۆڕانە دڵتەزێنەکانی ئینکیشاری، هەروەها لە بوارەکانی تریشدا هەوڵی نوێکردنەوەی دا. بەڵام سوپای ئینکیشاری توانییان خۆی لەسەر عەرش لادەن و وەزیرەکەیشی، کە بەوە تاوانبارکرا بەرپرسە لەم بیدعانە، بکوژن. لە ماوەی سەردەمی پێنج سوڵتاندا (١٧٠٣-١٧٨٩ز) هەوڵ و کۆششی جیاوازی چارەسەرسازی درا بەتایبەت لە بواری سەربازی و لق و بەشەکانی کە لێیدەبێتەوە لەوانە دامەزراندنی پەیمانگە بۆ خوێندنی ئەو بابەتانەی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی سوپا گونجاون وەك پەیمانگەی دەریاوانی و بیرکاری و ئەندازیاری.

وێڕای ئەو سنوورە بەرایییانەی کە ئەم ڕیفۆرم و چارەسەرسازییانە پێی گەیشتن، بەڵام بێ کاریگەر نەبوون. ڕاستە هەنگاوە ڕیفۆرمکارییەکان پێگەی ناوەکی سوڵتانیان بەهێز نەکرد،

[1] جب و بوون المجتمع الاسلامی والغرب، ج١ ص٥٧.

ڕێگەیشـــی نـــەدا ببێتـــە خـــاوەن ئـــامرازو کەرەســـتەکانی ڕووبەڕوبوونـەوەی ئەوروپیـەکان، بـەڵام ئـەم ڕیفۆرمانـە ڕێگـەیان بـۆ پێکهێنانی دەستەیەکی ڕۆشنگەری عوسمانی ڕەخساند تا زەمینە بۆ گەشەسەندنی فیکرێکی ڕیفۆرمخوازی کراوە بسازێنن. ئەم دەستە هەسـتی بـەوەکردبوو، کـە داتـەپین و لاوازی عوسمـانی کێشـەیەکە پشـــتگوێ ناخرێـــت و هێـــزی ئـــەورووپاش مەســـەلەیەکە بـــێ دەستکاریکردنی تێڕوانینی سونەتیانە بۆ ئەوی دی و تێگەیشتن لە زانستە نوێکان لە بەرامبەریدا هیچ ناکرێت.

ئەزمونەکـەی سـەلیمی سـێیەم (١٧٨٩-١٨٠٧ن) لـەم سـۆنگەوە سەرچـاوەدەگرێ، کاتێـک هەوڵیـدا پرۆســەیەکی چارەسەرسـازی گشتگیر بوونیادبنێت. سـەرباری ئـەوەی هـەل و مەرجـەکان بـە هیچ چەشـنێك و گونجـاوو لەبارنـەبوون، چـونکە ڕووبـەڕووی دژایـەتی ئەوروپیـەکان و لـەوەش زیـاتر لـە نێـو ویلایەتەکانـدا ڕووبـەڕووی یـاخیبوون و هەوڵـە جوداخوازیـەکانی بـووەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەزموونەکـەی دەوڵـەتی عوسمـانی فڕێدایـە نێـو سـەردەمی نوێـوە، کاریگەری ئەم ئەزموونە لەسەر گۆڕینی زەین و هۆشیاری خەڵك زۆر زیاتربوو لە گۆڕینی بۆ واقیعی ئاڵۆزو نالەباری دەوڵەتی عوسمانی.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین سەردەمی سەلیمی سێیەم گوزارشت بوو لـە سـەردەمێك، کە تیایدا گومانـەکانی ڕۆژهـەڵات لـە ڕۆژئاوا تـا ئەندازەیـەکی زۆر بەرتەسـك بـووەوە. وێـڕای ئـەوەی مـاوەی ئـەم "سـەردەم"ە کـورت بـو، بـەڵام ئـەو شـتەی لـە میانیـدا ڕوویـدا، گواستنەوە بوو لـە سـەردەمی ناکۆکیـە ئایینیەکانەوە بۆ سـەردەمی ناکۆکیـە سیاسیەکان و بەریەککـەوتن و لەیەکدانی بەرژەوەندیـەکان. ڕاستە خەونی ڕۆشنگەرە عوسمانییەکان بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن لـە زانســت و تەکنیکـە نوێکـان، کـە سەرچـاوەکەی ئـەوروپا بـوو لـە

ماوەیەکی کەمدا، جۆرێك لە ساویلکەیی لەخۆگرتبوو، بەڵام کەف و کوڵ و دڵگەرمییان بۆ کرانەوە بەڕووی ئەورووپادا وێڕای هەموو تەگەرەو بەربەستەکان لە کۆتاییدا ئاکامەکانی گرنگ و بەسوود بوون.

لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمداو بەشێوەیەکی تایبەت لە قۆناغی سەلیمی سێیەم دا، ئەویدی دۆزرایەوە، ئەورووپای مەسیحی ئیدی لەوە دەرچوو دژێکی تەماوی و نادیارو دورەدەست بێت، جیهانیش ئیدی دابەش نەبوبوو بۆ دوو بەش کە بەیەك ناگەن.

دۆزینەوەی ئەویدی، واتە پەیوەندی موسڵمانەکان لەگەڵ ئەورووپا، بووە هۆی گۆڕینی گۆشەنیگای موسڵمانەکان بۆخودی خۆیان، کە تا ئیستاش هەوڵەکان بۆ دیاریکردنی ئەم گۆشەنیگایە بەردەوامە.

# پێڕست

بێگومان ئەم کتێبە لەو کتێبە بایەخدارو گرنگانەیە، کە باس لە سەرەتای پەیوەندیەکانی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان دەکات لەگەڵ ژیاری نوێی ئەوروپادا، گرنگی و بایەخی کتێبەکەش لەوەدایە ئەو ڕاوبۆچوونە هەڵە ڕاستدەکاتەوە، کە بۆ ماوەیەکی زۆر باوبوو، گوایە سەرەتای پەیوەندی موسڵمانەکان لەگەڵ ژیاری ڕۆژئاوادا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری داگیرکردنی فەڕەنسیەکان بۆ میسر لە ساڵی( 1798ز) و ئەو ڕێنیسانسەی بەدوای خۆیدا هێنای. دوکتۆر خالد زیادە ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە، کە لەم ڕووەوە ئەزمونێکی تر هەیە، نزیکەی سەدەیەك دەکەوێتە پێش ئەزمونەکەی میسرەوە، ئەویش دۆزینەوەی دەوڵەتی عوسمانییە بۆ پێشکەوتنی ئەوروپا لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم و هەوڵدانە بۆ وەرگرتن لە ڕۆژئاوا هەر لەو کاتەوە.



لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیرانی (ی.ن.ك)

نرخ ( 2000 ) دینار